# دیوانی شێخ حەمەمارف مەریوانی

به کردوکۆشی(کۆکردنەوە و راستکردنەوەی شیعرەکان): **سەیید عیرفان خالیدی**

پێداچوونەوە و هەڵەگری و رازاندنەوەی لاپەڕەکان: **بەرزان حسەینی**

تەرحی رووبەرگ: **سەعید سوبحانی**

چاپی یەکەم، ۱۳۹۲ ی کۆچی هەتاوی

ISBN: 978-600-6814-13-1

**ناوەندی چاپ و بڵاوکردنەوەی ئەوین:**

مەریوان – کۆتایی شەقامی مەردۆخ تەلەفوون: ۳۲۲۶۶۶۴ ۰۸۷۵- ۰۹۱۸۷۷۵۴۴۰۴

Web: www.awinbook.com Email: awin9804@gmail.com

سرشناسه : مارفی مریوانی، محمد
عنوان قراردادی : دیوان. کردی
عنوان و نام پدیدآور : دیوانی شیخ حەمە مارفیمەریوانی/ گردآورنده عرفان خالدی.
مشخصات نشر : کردستان: ئەوین، ۱۳۹۲.
مشخصات ظاهری : ۹۲ ص. ۴۰۰۰۰ ریال
شابک : 978-600-6814-13-1
وضعیت فهرست نویسی : فیپا
یادداشت : کردی.
موضوع : شعر کردی — قرن ۱۴
شناسه افزوده : خالدی، عرفان، ۱۳۵۲ -، گردآورنده
رده بندی کنگره : ۱۳۹۲ ۲م۷۴۳س/ PIR۳۲۵۶
رده بندی دیویی : ۸فا۹/۲۱
شماره کتابشناسی ملی : ۳۱۱۰۷۶۱

# دیــوانـی شێخ حەمەمارف
## مـەریـوانـی

به کردوکۆشی:

(کۆکردنەوە و ڕاستکردنەوەی شیعرەکان)

سەیید عیرفان خالیدی

Awin Publications

ناوەندی چاپ و بڵاوکردنەوەی ئەوین

**پێشکەش بە :**

سەرجەم ئەویندارانی و لایەنگرانی ئەدەب و فەرهەنگی کورد؛ بەتایبەت ئەوانەی کە تامەزرۆی شیعرەکان و قسە خۆشەکانی مامۆستا شێخ حەمەمارفی مەریوانین!

هەستی پێزانینی خۆیشم بەم شێوەیە بەرامبەر بە هەموو ئەو کەسانەی کە بۆ پێگەیشتنی ئەم بەرهەمە یارمەتیان دام؛ بەتایبەت کوڕەکانی مامۆستا شێخ حەمەمارف، کاک موحەممەد و کاک هیوای حەسەنی دەرئەبڕم!

# ناوەڕۆک

**پێشەکی** (ژیاننامەی مامۆستا شێخ حەمە مارف حەسەنی)

مەریوان، مەڵبەندی شاعیران، رووناکبیران، نووسەران و خواناسانی کوردستان بووە. بەدرێژایی مێژوو تا ئێستا دەیان رۆڵەی بلیمەتی لە داوێنی خۆیدا بارهێناوە و بۆ خزمەت مرۆڤایەتی بە عام و کۆمەڵی کوردەواری بە تایبەت، پەروەردەی کردووە و رەوانەی مەیدانی کردەوەی کردوون. تا وەک بەرپرسێکی دڵسۆز و تا ئەو جێگەی لە ورە و توانایاندا بووبێ، بە گەلی کوردی هەژار خزمەتی بێوچان بکەن.

ئەم ناوچە سەرسەوز و شاخاویە بۆتە جێگای دەیان شاعیر و نووسەر و مامۆستایانی ئایینی کە بە کەلام و نووسینی جوان، باخی ژیانیان رازاندووەتەوە و خزمەتی فەرهەنگ و ئەدب و ئایینی خۆیان کردووە. یەکێ لەو شاعیر و رووناکبیر و خاوەنهۆشانەی شاری مەریوان، مامۆستا شێخ حەمە مارف حەسەنی بووە کە لە ماوەی ژیانیدا، گەلێک خزمەتی بە شێعر و ئەدەبی کوردی کردووە.

مامۆستا شێخ حەمە مارف کوڕی شێخ فەتاح، کوڕی شێخ قادر، کوڕی شێخ حامد، کوڕی شێخ عبدالکریم، کوڕی شێخ عبدالرحمن، کوڕی شێخ شمس‌الدین دوم، کوڕی شێخ عبدالغفار دوم، کوڕی شێخ شمس‌الدین ئەوەڵ، کوڕی شێخ عبدالغفاری ئەوەڵ، کوڕی مەلا گوشایش، کوڕی شێخ مەحەمەد مەردۆخی‌یە. ئەم زاتانە شەجەرەی نەسەبیان هەیە تا ئەگاتە لای حەزرەتی ئیمام حەسەن کوڕی ئیمام عەلی (خ).[1]

---

١. مدرس، عبدالکریم، بنەماڵەی زانیاران ص ١١٦، چاپخانەی شەفەق، چاپی یەکەم، ١٩٨۴

مامۆستا شێخ حەمەمارف حەسەنی لە شەشەمین ڕۆژی مانگی پووشپەڕی ساڵی ١٣٠٦ کۆچی هەتاوی لە بنەماڵەیەکی ئایینی و ناوداری کوردستان (مەردۆخی) لە ئاوایی بەردەڕەشەی مەریوان هاتووەتە دونیاوە. هەر لە منداڵی‌یەوە لە خزمەت باوکیدا خوێندویەتی‌و قورئان و موقەددەمات تەواو دەکا. ئەمجار بۆ درێژەدانی خوێندن ڕەوانەی کوردستانی باشوور (ئێراق) دەبێت و لە کەرکوک دەگیرسێتەوە و لە مزگەوتی حەسەن مەکی، عولومی عەقڵی و نەقڵی دەخوێنێت. پاش ماوەیێک دەگەڕێتەوە خزمەت باوکی و زانستی (منطق) تەواو دەکا. دوای ماوەیێک بۆ دووەمین‌جار دەڕوات بۆ باشووری کوردستان و لە پێنجوێن لە خزمەت مامۆستا مەلا ئیسماعیل پێنجوێنی (مختصر کتاب علم و بیان، جمع‌الجوامع، تفسیر بیضاوی و ...) دەخوێنێت و هەر لە خزمەت ئەم مامۆستا گەورەیە خوێندن تەواو دەکات و ئیجازەنامە وەردەگرێ و دەگەڕێتەوە بۆ گوندەکەی خۆیان ئەبێت بە مامۆستا لە جێی باوکیدا.

ساڵی ١٣٢٢ کۆچی هەتاوی لەگەل مەحبوبە خانم کچی مامۆستا شێخ عارف درگاشێخان ئیزدواج دەکا و دوو منداڵی بە ناوەکانی موحەممەد و فاتمە لێ بووە. پاشان بە نەخۆشین مردووە. لە دوای مەرگی ئەو خانمە، کچێکی دیکەی مامۆستا بە ناوی مەلیحە خانم هانیوە و لەویش دوو منداڵی بە ناوەکانی لەتیف و بورهان لێ بووە. پاش مەرگی ئەم خانمەیش بە نەخۆشین، لە ساڵی ١٣٣٤ کۆچی هەتاوی لەگەل حەسیبە خانم کچی مامۆستا و زانای پایەبەرز حاجی سەیید بابەشێخ ئاڵمانە ئیزدواج دەکا و پێنج منداڵیشی بە ناوەکانی پرشنگ، گەلاوێژ، چنوور، هیوا و کاوە لەو بووە.

مامۆستا ساڵێک لە گوندی بەردەڕەشە مودەڕیس بووە، ئەمجار بە یەکجاری گوندەکەی خۆیان بەجێ دێڵێت و بەرەو مەریوان کۆچ دەکا و لە گەڕەکی هەژارە ماڵێک دەسێنێت. دەست لە مەلایەتی هەڵدەگرێت و پیشەی خەیاتی بۆ خۆی هەڵئەبژێرێت.

مامۆستا شێخ حەمەمارف لەگەل مامۆستا سەیید عەلی خالیدی نێ، شێخ ئەحمەدی کانی‌میران، مەلاکەریم بناوەچلە، مەلاکەریم سەردۆش، مەلا

موحەممەد جەوانرودی، شێخ عوسمان خالیدی، شێخ لەتیف شێخ‌الاسلامی، شێخ رەشید حەسەینی، شێخ لەتیف خالیدی، سەیید عومەر خالیدی و ... دۆست بووە و بەسەرهاتی خۆشیان پێکەوە هەیە.

لەگەل مامۆستایان شێخ ئەحمەدی کانی‌میران و مەلاکەریم بناوەچڵە دەڕۆن بۆ بیارە بۆ خزمەتی حەزرەتی شێخ عوسمان نەقشبەندی، شێخ ئیجازە نادات کە مامۆستا بگەڕێتەوە و داوای لێ ئەکا ببێ بە کاتیبی، ئەویش قەبوولی ئەکا. جارێک پێنوسێکی بە خەڵات پێ‌ئەدا نامەیەکیشی بۆ ئەنووسێ، شێخ حەمە مارفی شاعیریش لە وەڵاما ئەنووسێت:

پیـــری دەســـــگیرم ســـــەرکۆماری دیـــن
ســــەرچاوەی کـــانی ســـــازگاری ژیـــن

پێ‌نوســـــــت رازی دڵـــــم ئەنووســـــێ
چـاوم بــە فرمێســک دووریـت ئەخووســێ

هـــەرکات ئـــارەزووی خزمـــەت بێتەبـــەر
لــە وولــەی دەروون دووکــەڵ دێتــە ســەر

رجـــام ئەوەیـــە شـــای شـــیرین کـــەلام
لـــــە بیـــرت نـــــەچم بـــاقی والســـــلام

پاش چەند ساڵ ئەگەڕێتەوە بۆ ئێران و ئەمجارە دەچێت بۆ تاران و لە ئێزگەی رادیۆ تاران بەشی تەرجەمەی زمانی عەرەبی و بەشی کوردی، ئیش دەکات و لە سەر ئەو کارە چوار ساڵ دەمێنێتەوە تا ساڵی ١٣٥٧ کۆچی هەتاوی، بە دەستپێکرانی خەباتی خەڵکی ئێران دژی رژیمی پاشایەتی، تێکۆشانی خۆی پەرە پێ‌ئەدا و پاش سەرکەوتنی شۆڕشی ئیسلامی، ئەگەڕێتەوە بۆ کوردستان و لە ئێزگەی رادیۆ مەریوان دەست بە کار ئەکات، کە لە ئاگادار کردنەوەی خەڵک ڕوڵێکی بەرچاوی گێڕاوە.

مامۆستا ساڵی ١٣٥٩ کۆچی هەتاوی بە ماڵۆ دەچێت بۆ کوردستانی ئێراق تا ساڵی ١٣٦٢ دەمێنێتەوە. پاشان ئەگەڕێتەوە بۆ بانە، لە دوای ساڵێک ئەچێت

بۆ سنه و تا ساڵی ١٣٦٤ ئەمێنێتوە. ئەمجار بە یەکجاری ئەگەڕێتەوە بۆ زێدی خۆی، واتە مەریوان.

مامۆستا شێخ حەمەمارف ساڵی ١٣٦٢ تا ١٣٦٨ کۆچی هەتاوی لە دەبیرستانەکانی مەریوان و سەوڵاوا و نێ، تەدریس ئەدەبیات عەرەبی و فارسی دەکات. پاش چووار ساڵ ئیش کردن جووابی ئەکەن.

مامۆستا پاش جوواب کردن لەو کارە، بۆ بەڕێوەبردنی ژیانی روو دەکاتە شۆرای رۆحانییەت و لەوێدا بە تەدریسی عولومی عەقڵی و نەقڵی مەشغوڵ دەبێت و لە ساڵی ١٣٦٩ کۆچی هەتاوی، تا ساڵی ١٣٧٥ چەندین تەلەبە لە خزمەتیا دەخوێنن و ئیجازە مامۆستایی وەردەگرن.

لەم کەسایەتییە بەڕێزە ئەمڕۆ دەیان و سەدان قسەی خۆش و خاترەی باش ئەگێڕنەوە، بۆ نموونە: رۆژێک تەلەبەیە لێی دەپرسێ: ئینسان لە خاکوخۆڵ درووس بوە یا لە گڵ؟ مامۆستا دەڵێ: لە خاکوخۆڵ. تەلەبە ئینکاری دەکا و ئەڵێ: نەخەیر لە گڵ. مامۆستا لەوەڵاما دەڵێ: ئەگەر لە گڵ خەلق بووایە، ئەم هەموو درز و کونەی تیانەئەبوو!

مامۆستا شێخ حەمەمارف، پیاوێکی زانا، خۆشخەت، وێنەکێش، رووناکبیر و تێکۆشەرێکی نیشتمانپەروەر و خاوەنی هەستێکی یەکجار ناسکی شاعیرانە بووە. دژ بە خورافات و باوەڕی پووچ، بە شیعر و وتار بەربەرەکانێی دەکرد. لە زۆربەی هەڵبەستەکانیدا، گەلی کورد بۆ فێربوونی عیلم و زانست هان دەدا. بۆ نموونە دەڵێت:

ئاخـــرین پەنـــدم زۆر پایـــەبـــەرزە
بـــۆ نیگـــاداری، جێگـــای ئـــەو مـــەغزە

تـــۆ و کاکـــت بـــڕۆن خوێنـــدن بخـــوێنن
مـــافی گـــەل و هـــۆز خۆتـــان بســـێنن

بـــە خوێنـــدن هـــەموو دەرد ئـــەبێ چـــارە
بێســـەواد وەکـــوو کـــوێری بێـــدارە

مامۆستا هۆگری شاعیرانی بەناوبانگی کوردستان (قانیع، بێسارانی، مەولەوی، بێکەس و شێخ رەزای تاڵەبانی) بووە و شیعرە جوانەکانیان شوێنێکی یەکجار بەنرخیان لە سەر بیروڕای ئەو داناوە. بۆ نموونە ئەتوانین بڵێین کە مامۆستا لە شیعری (ئاواتی دڵ) لە شاعیری گەورەی کورد مامۆستا قانێع (خوزگەی قانێع) و لە شێعری (لایە لایەی خێزانم) لە شیعری لایە لایەی مامۆستا فایەق بێکەس ئیلهامی وەرگرتووە.

مامۆستا لە زۆربەی کۆنگرە و کۆڕەکان کە بۆ شاعیران و نووسەران و زانایانی ئایینی دەگیرا، بە وتار و سوخەنڕانی بەشداری دەکرد و کۆڕەکانی بە قسە بەنرخەکانی دەڕازاندەوە. بۆ نموونە سەبارەت بە مامۆستا فایەق بێکەس دەڵێت:

"ئەڕوین بۆلای یارانی خاوەنهەست، یارانێ کە وتاریان هەموو جامێکە لێوانڕێژ لە بادەی ئەلەست، کە دڵی هەرکەس ئەخاتە نەشئە؛ بەڵام زۆرجاریش وتارەکانیان تاڵاوێک بووە، چووە بە گەڵووی زۆردارانا و بەمبۆنەوە لە بارەگایان بێکەسی هێشتوون. ئەو بێکەسانەی کە کەسی هەموو کەسن، هەرچەن بەڕووالەت بێکەسن، ئەو بێکەسانە کە وەتەن روالەتگایان بووە بۆ ئەوینی و گڵپەی لە دەروونیانۆ هەڵساندووە. گڕ و گڵپەیەک کە هەتاهەتایە هەر ئەگرێ و ڕێی ئەویندارانی نیشتمان روون ئەکاتەوە، جا لەم پەروازەدا لە هەوارگەی ئەو کەسە سەر ئەدەین کە وەتەن کەسی بووە. مەبەست بێکەسە، کە بە بێکەسی بە سەر کەسدارا فایەق بووە، و لە باخی پڕ گوڵاڵەی فایەق بێکەس گوڵێک ئەچنین و بە دیاری پێشکەش بە ئێوەی خۆشەویستی ئەکەین."

مامۆستا لە دووهەمین کۆنگەرەی مامۆستا بێسارانی، بە وتار بەشداری ئەکا و دەڵێ:

"بە ناشوکری ناڵێم؛ بەڵکوو گلەییم هەیە لە یاسای چارەنووس کە دوو چین لە ناو ئێمەدا بە داماوی ژیاون؛ یەکەم مامۆستا، دووەم شاعیر، جا بەداخەوە بێسارانی هەردووکیان بووە!"

ئەم زانایە بە کوردی و فارسی شیعری داناوە و شاعیرێکی توانا و لێزان بووە. لە ناو شیعرەکانیدا زەرافەت و سەلیقەیەکی هەرەبەرزی شاعێرانەیان تێدا بەکار هاتووە، شاعیرێکی بەرپرس و مرۆڤێکی ئازادیخواز بووە و شیعرە نیشتمانییەکان و کۆمەڵایەتییەکان و تەنزەکانی، بەڵگەی روون و پێشکەوتووخوازانەی ئەون.

لە شیعری مامۆستا بۆ گۆرانی کەڵک وەرگیراوە. ئەتوانین ئیشارە بکەین بە شیعری عەیش و نۆش(خرخاڵی خرخاڵی، ناسکونۆڵو منداڵی. کیژێ شەلا تۆم بووایە، دوو شەوان بە حەڵاڵی) کە لەلایەن هونەرمەند کاک "ناسری رەزازی"یەوە خوێندراوە.

لە کۆچی مێژوویی شاری مەریوان بەرەو ئاوایی کانیمیران، شیعرێکی بەناو (بانگی نیشتمان) وتووە. لە شیعری (بۆچی ناخەوم) وێنەیێک لە سەردەمی ژیانی پڕ لە دەرد و مەینەتی خۆی هێناوەتە ڕوو و دەڵێ:

نـــازانم ئەمشـــەو بـــۆچی ناخـــەوم
لـــە دالْغـــەو و خـــەیاڵ ســـاتێ ناکـــەوم

نـــازانم بـــۆچی خـــەوم ڕەویـــوە
دونیـــای ســـەنگینم لـــە ســـەر ســـەپیوە

لە نووسینی تەنز دەستێکی باڵا و توانای هەبووە، بۆ نموونە ئەتوانین ئیشارە بکەین بە شیعری (خوا لاماندا لە کەر) و (شەڕنامە) و .... .

مامۆستا لە ناو شیعرەکانیدا، دووجار لە نازناوی (ژاکاو) کەڵکی وەرگرتوە و دەڵێ:

لە نێو ئەم هەموو لار و ناپاکە
گەرەکتە بڵێی "ژاکاو" مەژاکە؟

یان لە شیعری "زانا"دا دەڵێت:

" ژاکـــــاو " مەبەستی ئەو کەسانەیە
بە چاک و مێزەر خۆی کردوە دیاری

مامۆستا لە ساڵی ١٣٧٦ کۆچی هەتاوی بۆ سەردانی دوکتور دەچێتە سنە و پارەیێکی زۆری لێ دەسێنن، بە دوکتور ئەڵێت: ئەزانی فەرقی دوکتور و قابیز چییە؟ دوکتور ئەڵێت: نەخەیر! مامۆستا ئەڵێت: قابیز فەقەت گیانت ئەکێشێ؛ بەڵام دوکتور ماڵ و گیانت!

هەر لەو ساڵەدا تووشی نەخۆشی شێرپەنجەی کەبەد(جگەر) ئەبێ و ئێش و ژان ئۆقرەی لێ ئەبڕێ. هەوڵێکی زۆر ئەدا؛ بەڵام چارە و عیلاجی نابێ. بەداخەوە شاعیری ناسکهەست و نیشتمانپەروەر لە ئاخرین ڕۆژی مانگی پووشپەڕی ساڵی ١٣٧٧ کۆچی هەتاوی بۆ هەمیشە چاوی لێک دەنێ و ماڵئاوایی لە گەل و نیشتمانەکەی دەکا و لە تەنیشت باوکیدا لە ناو باخی خۆیان لە بەردەڕەشەی مەریوان بە کۆشی خاک ئەسپێردرێت. ماتەم تەواو کوردستانی گرت، کۆچی ئەم بلیمەتە نەک هەر زیانێکی گەورە و شوێنپڕەوەنەبوو بوو؛ بەڵکوو زیانێکی گەورە و کاریگەر بوو بۆ ئەدەب و کولتووری کوردی. ڕۆحی شاد و ڕێگای پڕ ڕێبوار بێت.

سەیید عیرفان خالیدی

مەریوان پاییزی ١٣٩١ کۆچی هەتاوی

**خوێنەرانی هێژا!**

ئێمە وەکوو ئەرکی سەرشانی خۆمان، هەموو هەوڵمان داوە تا بەرهەمێکی پوختە و ڕازاوە پێشکەشی ئێوەی ئازیز و نەتەوەکەمان لە ئێستە و داهاتوودا بکەین؛ بەڵام بڕوامان وا نییە کە فرمانەکەمان ڕەخنەهەڵنەگر بێت. کەوابوو دەستی ئەو کەسانە ماچ ئەکەین کە بەرپرسانە ڕەخنەمان لێ ئەگرن، یان ئەگەر نووسراوەیەکی ئەم شاعیرەیان لەلایە بۆمان ئەنێرن تا چاپی داهاتووی ئەم بەرهەمە بە هەوڵی گشتمان کامڵتر بێت. <u>ڕێگاکانی پێوەندی لەگەڵ ئێمە لە پێناسەی کتێبەکەدا هاتووە (لاپەڕەی ٢).</u>

# وتوویژ لە تەک دەوەن

دەوەن تۆ بۆچی کز و داماوی
نەخۆشینت هەس، یا تینووی ئاوی؟

هەرچیٚ تێبینی ئەکەم لەم بارە
فەرقی تۆ نییە لە تەک ئەو دارە

بڕوا ئەو دارە چەن گەش و بەرزە[1]
ئەشنییێتەوە بە هەزار تەرزە

پەل و پۆ مەحکەم، بالاّ زۆر قەوی[2]
ریشەی کوتاوە بۆ ناخی زەوی[3]

نە هەتاو نە سا، نە سەرما نە با
بە هیچ شێوەیێ زەبری پێ نابا[4]

روونە لەلای من کە تۆ بەڕواری
بە بێجیاوازی، لە جنسی داری[5]

---

[1]. ئابەم شێوەیشە هاتووە: "بڕوا ئەو دارە چەن گەش و سەوزە"
[2]. ئابەم شێوەیشە هاتووە: "پەل و پۆ پتەو، بالاّ زۆر قەوی"
[3]. ئابەم شێوەیشە هاتووە: "رەگی داداوە، بۆ بە ناخی زەوی"
[4]. ئابەم شێوەیشە هاتووە: "بە هیچ کلوزێ زەبری پێ نابا"
[5]. ئابەم شێوەیشە هاتووە: "بە بێ جیاوازی رەگەزی داری"

تـــۆ بـــۆچی دایـــم هــــەڵپرووکاوی
ســـەر و گـــوێ شـــکاو، بـــاڵا زامـــاوی

پـــرژ و پـــەل بـــڵاو، چـــەوت و گـــرێدار[٦]
هـــیچ بـــەرزۆ نـــابی، خـــۆت بکـــەی بـــە دار

دەردی تـــۆ چییـــە خـــۆ بـــێئـــازاری
ئـــەڵێی چەوســـاوەی دەســـی زۆرداری؟!

---

٦. ئابەم شێوەیشە هاتووە: "پرژ و پەل براو خوار و گرێدار"

## وەڵامی دەوەن

خاڵــــە دەردی مـــــن زۆر ئاشــــکرایە
بــۆت بــەیان بکــەم حــاڵم بــۆ وایــە؟

جێگـــــای ژیـــــانم نزیـــــک ماڵانــــــە
بۆیـــە بـــەم جـــۆرە ژیـــنم تاڵانـــە

لــە بــێ بــەزە و هەســت، نزیکــە شــوێنم
بـــــەم نزیکییــــــە، هـــــەدەرە خـــــوێنم!

ســـــەری‌ســـــاڵ وەختـــــی ژیانـــــەوەمـــــە
کـــــاتی پـــــرژ و بـــــاڵ هێنانـــــەوەمـــــە

حـــــەیوان و مـــــاڵات ئەکەنـــــە گیـــــانم
ئـــەخورێ و ئـــەوەرێ، گۆپکـــەی ژیـــانم

فرســـەتم نـــادەن لـــە ئـــێش و ئـــازار[7]
تـــا بـــاڵا بکـــەم، بـــۆ خـــۆم ببمـــە دار

ئـــازار ئەچەشـــم لـــە ســـەر هـــەتا ڕەگ
سـوێم ئەبێتـەوە، ئەچمـە شـەرای مـەرگ

بــە هیــوای ژیــان زۆر بــە بەوبــەختی[8]
پــرژ و بــاڵ ئێنمــۆ زۆر بــە ســەرســەختی[9]

---

[7]. ئابەم شێوەیشە هاتووە: "هیچ ماوەم نادەن لە ئێش و ئازار"
[8]. ئابەم شێوەیشە هاتووە: "بە هیوای دوارۆژ زۆر بە بەوبەختی"

تــا یــەم بــە خۆمــا بــۆ پــرژ و بــاڵیٚ
ئــەڕوانم وا هــات گۆشــت و خــویٚن تــاڵیٚ

هــەر پــەلیٚم باشــە، بــە بــیٚ ڕەحمانــە
ئــــەیبــڕیٚ و ئــــەیبا ئــــەو بیٚئیمانــــە[10]

دوای ئــەو یــەکیٚتر، دوای ئــەو یــەکیٚتر
یەک بە شویٚن یەکا، یەک لـە یەک بەدتر

بــۆ پــەرژینــی بــاخ، بــۆ کــەپر و ســیٚبەر
بۆ حەوشە و پەرژین، بۆ پەرچە و دیٚبەر

بــــە بیٚبــــەزەیی ئــــەمبڕن، ئەمبــــەن
بــە تــەور و تــەوراس، ریشــەکەنمەکــەن

بــەم حاڵــە هیٚشــتا مــەئیوس نــیم لــە ژیــن
ژیـان زۆر خۆشـە، حــەز ئەکــەم لــە ژیــن

پــیٚم خۆشــە منــیش وەک بــاقی داران[11]
لــە مەڵبەنــدی خــۆم، دوور لــە بــەدکاران

بــــژیم، بــــاڵا کــــەم، ببمــــە گــــەورەدار
خــاوەن بــارە بــم، بــیٚ ئــەرک و ئــازار[12]

---

. ئابەم شیٚوەیشە هاتووە: "پرژو باڵ ئیٚنمۆ هەر بە سەرسەختی"
١. ئابەم شیٚوەیشە هاتووە: "ئەیبڕیٚ و ئەیبا بۆ سەر تیٚلانە"
١. ئابەم شیٚوەیشە هاتووە: " حەز ئەکەم منیش وەک باقی داران"
١. ئابەم شیٚوەیشە هاتووە: "داریٚ بارەدار بیٚ ئەرک و ئازار"

تـــا رۆژێ مـــاوم بـــە ســـەر دنیـــاوە
شـــنەم بـــێ بـــە دەم شـــەماڵ و بـــاوە

بـــە ورەی بـــەرز لـــە دژی زۆردار
هەڵمـــداوەتۆ تـــا ئێســـتە ســـەد جـــار[13]

هۆمێـــدم پەنـــدی کـــوردانی هـــەژار
کـــە ئـــەڵـێن دەوەن هـــەر ئـــەبێ بـــەدار؟!

بـــەڵام داخەکـــەم مـــاوەم نـــادەنێ
زۆردار لـــە ریشـــە دەرمئـــەهێنێ

ئەکەومـــە ئـــەوە لـــە خـــەم بڕەســـم
تـــەور بـــە دەســـێ ئـــەبڕێ بڕەســـم

خـــاوەنم زۆرە؛ خـــاوەنی زۆردار[14]
بـەش بـەش کـراوم؛ وەک کـوردی هـەژار

نـــازانم چییـــە و چ دەلیلێکـــە
هـــەر پـــەلم بـــە دەس ئیزاریلێکـــە!

بۆ هـەرکـەس لـەمـە هـەلێ بـەدەسکـەوت[15]
رەحـــم و بـــەزەیی تـــەواو لێهەڵکـــەوت

---

١٣. ئابەم شێوەیشە هاتووە: "باڵام کێشاوە خۆم بکەم رزگار"

١٤. ئابەم شێوەیشە هاتووە: "زاڵمم زۆرە، زاڵمی زۆردار"

١٥. ئابەم شێوەیشە هاتووە: "بۆ هەرکەس لە تەک فرسەتێ دەسکەوت"

بۆ هەرکەس لە تەک دەستی کەوتە کار
لە عاستی فەقیر، بوو بە گورگە هار

نازانم بۆچی دوو دەسی سروشت
دایم هەر چینی لاوازانی کوشت

بەڵام خاڵە گیان مەڵێ فەوتاوە
ورەم بەهێزە و رەگم هەر ماوە[16]

لەمە زیاتر کوشتەی زاڵم بم
گیرۆدەی ژینی سوێر و تاڵم بم

بۆ ئاکامی خۆم بۆ مافی رەوام
کۆڵ نادەم و هەر لە سەر ئەو بڕوام[17]

چاوەڕانی فرسەت و هەلم
بە پشتیوانی گشت هۆز و گەلم

هەتا هەتایە زۆر بکا زۆردار
رۆژێ هەر ئەبێ دەوەن بێ بە دار!

*

---

[16]. ئابەم شێوەیشە هاتووە: "هۆمێدم قەوی و رەگم هەر ماوە"

[17]. ئابەم شێوەیشە هاتووە: "کۆڵ نادەم هەتا لەڕووی ئەم دونیام"

# لایە لایەی خێزانم

*رۆڵە لای لایە، کوڕم لای لایە*
*ئەمشەو بۆچی تۆ هیچ خەوت نایە*

رۆڵە ئەزانم هێشتا مناڵی
ساوای نەرم و شل، بەگڕوگاڵی

بەڵام تەقالا و نیگای تۆ بۆ من
خستوومیەتە ناو ئەندێشەی بێبن

هەرچەن چکۆلە و بەستەزمانی
ناشێ بۆ دنیا و ژینو بڕوانی

بڵێی لەم دنیا پان و هەراوە
بۆچی دەس و پێم موحکەم بەستراوە

لە نێو لانکەدا بەم جۆرە قەتیس
شەتەک دراوم بە پەت و گوریس

گوایە چیم کردووە، بەشی کێ ئەخۆم؟
خۆ شیری مەمکەی دایکی خۆم ئەخۆم!

*هەی لایە لایە، رۆڵە لای لایە*
*دنیا زیندانی پیاوی ئازایە*

رۆڵەی خڕین و دڵ پەرۆشەکەم
هێزی دوو ئەژنۆ، جگەرگۆشەکەم

پێت بڵێم بۆچی ئەسیر کراوی
لە نێو لانکەدا شەتەک دراوی

تا خووی پێ بگری بە کۆت و زەنجیر
بە پەلبەسراوی، هیچ نەبی زویر

دەس و پێت لە ژێر کۆتا نەتەزێ
رەمەقت نەڕوا و دڵت نەلەرزێ

ئەو بەند و کۆتە وەک شێری برسی
ئاڵۆزت بکا و لە هیچ نەترسی

بۆ نیشتمانت بە دڵ بجۆشی
بۆ گرتنی ماف زیاتر تێکۆشی

*هەی لایە لایە، رۆڵە لای لایە*
*پیاوی ترسنۆک حیزی گشت لایە*

رۆڵە پەندی من بۆ خۆت و کاکت
بۆ پاشەڕۆژی ژینی رووناکت

ئەم دنیا کەوا تۆ پێت تێناوە
رەنگاورەنگ هەروەک بووکی رازاوە

زاهیری وایە نێوی گەنیوە
بە مەسەل هەروەک "زرکەی تەپیو"ە

ساوای وەکو تۆ تەجرەبەی نییە
ئاگای لە بەزم و گۆبەندی نییە

پیری وەک بابت تەجرەبەی زۆرە
ئەزانێ دنیاکە بنکەی زۆرە

بۆ ئەوەی رەنجت بگا بە سەمەر
ئەبێ سەربەخۆ "لە کەل بیتە دەر"

نابێ هیچ وەختێ هەل بدەی لە دەس
هاتوو ئەو هەلە، قەت نەکەوتۆ دەس

داد بۆ ئەم و ئەو خووی پیاوی حیزە
کۆرِم مەسەلەس، "کەر بە نەقیزە"

دەخیل نامووست نەفرۆشی بە نان
سەرشۆڕ بوەستی بەرامبەر ویژدان

دەردی سەرشۆڕی، قەت چاری نایە
لە برسا مردن، لە چاوی شایە

دایکت بە هیواس کاتێ بوی بە لاو
لە ریزی پیاوا کەویتە بەر چاو

لە ژێر سایەتا بحەسێتەوە
وەک گوڵی تێراو بگەشێتەوە

وەک دایکانیتر بێ بەساحێب خێو
پاسەوانی بی لە جنۆکە و دێو

بە تیلایی چاو نیگای کرد هەرکەس
تێی هەڵەی هەتا ئەو پەڕی ئەتلەس

*هەی لایە لایە، ڕۆڵە لای لایە*
*"کورِ عەسای دەسە بۆ باب و دایە"*

ڕۆڵە بینایم، ڕۆڵەی شیرینم!
سۆمای دوو چاوم دەوای برینم!

ئاخەرین پەندم زۆر پایە بەرزە
بۆ نیگاداری، جێگای ئەو، مەغزە

تۆ و کاکت بڕۆن خوێندن بخوێنن
مافی گەل و هۆز خۆتان بسێنن

بە خوێندن هەموو دەرد ئەبێ چارە
بێسواد وەکوو کوێری بێدارە

نەک وەک زاناکان رابوردووی وڵات
خۆتان مەشغوڵ کەن بە ئەدەبیات[18]

یا تەحقیق لە سەر فەلسەفە و حیکمەت
بەرهەمیان نییە؛ بە غیر از نەگبەت

بە شیمی و فیزیک، سەرنج لە مادە
ئەسبابی مەردی ئەبێ ئامادە

بە زوان بە قەڵەم بە رەنج و خەبات
گیانتان بەخت کەن لە ڕێگەی وڵات

بۆ داوا و نزا کەس گوێ ناگرێ
حەق ئەگەر حەقە، بە شەق ئەسنرێ

ئەبەد نامرێ و ناوی زیندووە
ئەوەی لە ڕێگای گەلا تیاچووە

*هەی لایە لایە، ڕۆڵە لای لایە*
*شەرەف گەنجێکە هەر دوایی نایە*

❊

---

[18]. ئابەم شێوەیشە هاتووە: "خۆتان مەشغووڵ کەن بە ذات و صفات"

# سکاڵا لە دەس چەرخ

خوای بێشەریک! ئاگاداری دڵ
عەرزێکم هەیە با نەیبەمە گڵ

ئەم دنیا ئەڵێی تیاترۆیە
راسی نەماوە هەمووی درۆیە

گەورە تا بچووک پیشەی لارییە
راسی ئەر مابێ دەردی کارییە

هەموو یاسایە پێچەوانەیە
مرۆڤ رەوشتی وەک دێوانەیە

"شرع" وەرگەڕاوە کراوە بە "عرش"
خاوەنفام با هەر سک بدا لە فەرش

مەسەلەی شەرع و تەڵاق و نیکاح
بووە بە گاڵتەی گەوج و زەبەلاح

تووی ڕاسی لە ڕووی بیسات بڕاوە
پەردەی ناموس و حەیا دڕاوە

پارەدار بۆ خۆی هەمەکارەیە
قازی گوێ لە مشت، پوڵ و پارەیە

دزی میلیۆنی ڕێزلێگیراوە
دیل و بەندەیە، دزی ئافتاوە

خوێنمژین زاڵم ئەڵێن هونەرە
قورئانخوێندنی هەژار، تەشەرە

قسەی راس هیچ کەس گوێی بۆ ناگرێ
بە کار هێنراوە، درۆی بەکرێ

چینی شەرعزان، "عوامالناسە"
عەلامەی دەهر، مەلا تەوراسە

ئەوەی تەمەنی بە ساڵا چووە
گاڵتەجاڕی لای لووس و بێمووە

لە نێو ئەم هەموو لار و ناپاکە
گەرەکتە بڵێی، "ژاکاو" مەژاکە!

✻

## شانۆی یەکەم

دەسـا فریشـتە وازبێنـە لـە خـاو
پێشـانگای دونیـا بهێنـە بـەر چـاو

هـەزاران منـداڵ سـەر و پـێ پـەتی
مل بـە رەگـێ بـەن، برسـی و عـەزرەتی

هـەزاران هـەتیو چـاو پـڕ لـە گریـان
دەرگـا و دەرگـا کـەر بـۆ تیکەیـە نـان

چـە کورِ و کچـێ، بـێ دایک و بێ باب
بـۆ بـزەی لێـوێ بـوون بـە کـەبـاب

چـەن ورگـی برسـی بـە پشـتا لکـاو
رەق و کۆمـاوە زیـز و حەپەسـاو

پیـری چەوسـاوەی دەسـتی هـەژاری
دایـم لارەمـل لـە تـاو قـەرزاری

ژن و پیاوی پیر؛ وشک و رەش وەک قیر
بێدەخـڵ و بـێکـار، بێڕەمـەق زویـر

لـە بـەر بروسـکە و هـەتاوی بـێتـین
وتووێژیانـە سـەبارەت بـە ژیـن

دایکـی منـداڵی مـەمک تـۆزێ چـەق
سـاوا ئـەیمـژێ ئـەڕوانێ زەقزەق

لە گوێ کوانووا چوارمشقەی داوە
بە کوڵی گریان جەرگی بڕاوە

سەدها پیرەژن، چەنێ چەرموو ئێسک
کاڵانەی چاوی پڕە لە فرمێسک

سەدها گەورە کچ کە بێتین ماوە
هەر تەنیا کوڵمی بە جوانی ماوە

لای دەرگا وەستاو چاو لە گوزەرە
بۆ چارەنووسی دەسەو نەزەرە

چەنها نەخۆشی کەوتوو لە سک عەرز
بێدەوا وحەکیم هەڵچووقاوی لەرز

بە بێ ئەجەل وا بە فیرۆ ئەمرن
ئەسپەردەی خاک و کەندەری قەبرن

چەندە مامۆسای عەلامە و بەدین
خنکاو بە دووکەڵ کوێرەوری ژین

چەن لاوی دلێر ژیر و هەڵکەوتوو
لەخت و لاو جوان بالا پێکەوتوو

چەن خاوەن دڵی زینوو و بێکارن
وێڵ و سەرگەردان، لە ژین بێزارن

ئەر سووسە بکەی کە خاوەن بیرن
ئیتر زیندانی کۆت و زەنجیرن

چەن خوێندەواری ژیر و بلیمەت
دەس و پێ بەسراو بە زەنجیر و پەت

هەزار ناحەقی بکەی لە حەقیا
خوا نەکا نابێ، با بێ بە دەمیا

ئەر سکاڵایە بکرێ بە ئاشکار
ئیتر هەر سەرەو، ئەچێ بو سەر دار!

❊

# شانۆی دوهەم

ئا لەم شانۆدا چیت دێتە بەرچاو
هەزاران گاخۆر بێبەزە و ناپیاو

هەزاران سکزل مل کۆتە قەساب
لە ئاستی ڕاسی لار و بێحەساب

چەن لالەوەڕێ، بێدین و خوێن مژ
چەندە چڵکاوخۆر بێنان و پیاوکوژ

چەن بەر گاراجی بێناوو نیشان
را ئەبوێرێ بێئەزیەتکێشان

چەندە عەوامی لە خوا بێخەبەر
مەدرەک زانیاری، عەبایە و مێزەر

چەندە خۆفرۆش لە ڕێ حەق لارە
لە بۆ خوێنمژان فەرمانبەردارە

چەن دایکە خوگی بەکرێ گیراو
لە بۆ داگیرکەر؛ نەک چاوێ سەدچاو

غەرقن لە نێوی ناز و نیعمەتا
ئەمیر و ئاغا بە سەر میللەتا

*

## شانۆی سێهەم

لە شانۆی سێدا بیری کەرەوە
چاوێ هەڵبڕە لە بۆ سەرەوە

بڵێ بە یەزدان، خاوەنی هەستی
سازەندە و ڕێکخەر بڵندی و پەستی

حیکمەتی چییە ئەم تەفاوەتە
ئەم بەرزی و نزمی و ئەم عەداڵەتە

ئایا گاخۆر و سکزل و خوێنمژ
یا چڵکاوخۆر و بێبەزە و پیاوکوژ

هەر بەندەی تۆن و فەرمانبەردارن
بۆ ئەنجام دانی ئەمرت بە کارن؟

پاسەوان موڵک و سەروەت و ماڵن
خزمەتگوزاری خێزانی ماڵن

بۆیە سامان و ماڵ و دەسەڵات
هەمووی بۆ ئەوان بووە بە خەڵات

تیپی چەوساوە ڕۆژوو ناگرێ
نوێژ نەکەرە و گوێ بۆ حەق ناگرێ

ناتپەرەستن و بێئەمریت ئەکەن
تەنانەت بە کرێش ئیشت بۆ ناکەن!

*

# ئازادیخواز[١٩]

ئازادیخواز گری گری
کەوتە ژێر پێی درنج پەری

دێوی گاخۆری سەرسەری
ئازادیخوازی سەربڕی[٢٠]

میللەتێ بوون کوردی هەژار
چەوساوەی دەستی ئیستعمار

هانا بڕاو لە زوڵم و زۆر
وەک مردووی دەرهێنراو لەگۆڕ

کز و داماو و لارەمل
دەسە و نەزر بۆ چەن سکزل

لە بەر لرفەی چەن ملپانێ
دایم رەجال تیکەنانێ

بە شەو بە رۆژ بە خۆکوشتن
بە بێپشوو ئارەقڕشتن

گێرە و کێشە پاس و بەژار
بە چوار فەسڵە خەریکی کار

---

١٩. لە سەر هەوای فولکلۆری کوردی "هەلالە برایمە گری گری"

٢٠. ئەم بەیتە ئابەم شێوەیشە هاتووە: "دێوی گاخۆری بەدفەساڵ
ئازادیخوازی نایە چاڵ"

لــه هاوینــا لـــه ژێــر هــەتاو
وەکـــوو گۆشـــتی نیـــوەبـــرژاو

زســـتانیش ئـــەو قورپبـــەســـەره
چنـــگ و پـــەلی وەک کۆتـــەره

ئابـــەم جـۆره خـــەریک کـار بـوو
چـی بکـا؟ هـــەژار و ناچـار بـوو

ســـوود و مایـــەی ئـــەم داماوه
بەرهـــەمی ئـــەم بـــەشخـوراوه

هـی خـۆی نـەبوو، بـۆ سـکزل بـوو
ژن و منـــاڵی بـــێجـــل بـــوو

ســـەر بێڕەشـــتی، پـــێ بـــێکڵاش
مەسـەلە "سـەر ئاش و قنگ ماش"[21]

زســـتان بێنـــان، هـــاوین بـــێدۆ
تـــاڵانکـــراو و ڕەنجـــەڕۆ

لـــە بـــەر گـورگی دەور و پشـــتی
پـــولێ نـــەبوو لـــە نێـــو مشـــتی

بەرهـــەمی خـــۆی و خێزانـــی
دەر و دەشـــت و دەخـــڵ و دانـــی[22]

---

٢١. ئابەم شێوەیشە هاتووه: "مەسەلە "خۆ ماش و سەر ئاش" "

٢٢. ئابەم شێوەیشە هاتووه: "دەر و دەشت و سفره و خوانی"

گـــاخۆر تـــەواو هـــەمووی ئـــەبرد
ئـــەو لـــە دووروژ نیگـــای ئـــەکرد

چـــەنای چـــەن ســـاڵ ئـــەم دامـــاوە
ئـــا بـــەو رەنـــج و تـــەقالاوە

لـــە خـــەویش بیگوتایـــە بـــەش
بـــە شـــەق ئەخرایـــە کونـــە رەش

*ئـــــازادیخواز گـــــری گـــــری*
*کـــەوتـــە ژێـــر پـــێی درنـــج پـــەری*

ئـــەم گەلـــە وا کـــە ئـــەیزانی
کـــە تـــێغ گەیشـــت بـــە ئێســـقانی

راچڵـــەکـــا، هەڵســـا ســـەرپا
رووی کـــردە نێـــو دۆڵ و چیـــا

دەســـتی دایـــە کوتـــەک و دار
بـــۆ بـــەر هەڵســـتی ئیســـتعمار

لـــە نێـــو دارســـانی هـــەرد و کێـــو
خـــۆی قـــایم کـــرد لـــە جـــن و دێـــو

ئیتـــر مـــاوەی نـــەدا، گـــاخۆر
مـــافی ببـــا بـــە زۆڵـــم و زۆر

کـــارێ بکـــا خـــۆی و خێـــزان
وەکـــوو هـــەموو گـــەلی جیهـــان

لـــــه دێهـــات و شـــــار و دژی
بـــه ئـــازادی بـــۆ خـــۆی بـــژی

مەڵبـــەنی گـــەر، دەشـــت و کۆیـــە
هەر بۆ خۆی بێ، چوون هی خۆیە

چوونکـــه ڕەســـمی کـــول جیهانـــه
هـــەرچی چینـــه خـــاوەن نانـــه

ســوور و ســپی، هـــەم زەرد و ڕەش
بـــه گـــوێرەی خـــۆی بردوویـــه بـــەش

بـــۆچی ئـــەبێ هـــەر ئـــەم کـــز بـــێ
بەشـــی هـــەموو چـــز و بـــز بـــێ

*ئـــــازادیخواز گـــــری گـــــری*
*کەوتـــه ژێـــر پـــێی درنـــج پـــەری*

مـــاوەی چـــەن ســـاڵ بـــه بـــێوچـــان
بـــێ ڕێگـــا و جـــێ، بـــێ جـــل و نـــان

دژی گـــــــاخۆری تاوانبـــــــــار
خـــەباتی کـــرد بـــه بـــەرد و دار

کیـــــژی جـــــوان، لاوی دلیـــــر
پیـــری بـــه هەڵمـــەت وەکـــوو شـــێر

بـــێ مـــانوو بـــوون لـــه هـــەرد و کێـــو
لاشـــەی ئەخســـت لـــه جـــن و دێـــو

لە بەر خوێنی لاوی جوان
لالە ئەڕوا لە کوردستان

لە تاو خوێنی کیژی ناسک
بە گوڵی سوور، سوور بوو باسک

کۆڵنەدەر بوو تێئەکۆشی
زیاتر ئەبوو حیرس و جۆشی

رووت و قووت و تینوو و برسی
لە تۆپ و تانک نەبوو ترسی

داری داخست لە دەس گاخۆر
تەمێی کردن کزو سەرشۆڕ

لە مەڵبەندی پان و هەراو
کوردستانی داگیرکراو

جن و دێوی گسک لێدا
چڵکاوخۆری نسک پێدا

زۆری نەما چینی زۆردار
لە لاوازی کەوتە هاوار

چارە بڕاو کز و ناکام
کڕنۆشی برد بو مامە سام[۲۳]

---

۲۲. ئەم بەیتە ئابەم شێوەیشە هاتووە: "چارەی نەما باوی بولار
هاواری برد بۆ ئیستعمار"

*ئازادیخواز گری گری*
*کەوتە ژێر پێی درنج پەری*

ئیستعمار بێبەزە و دین
لە بۆ کوردان دڵ پڕ لە قین

چڵکاوخۆرانی پەنا دا
رەنجی کوردانی بە با دا

بە تێشاو و بە تێخوڕین
هەروەکوو سەگ کەوتە وەڕین

بۆ سوودی خۆی کەوتە پیلان
هەروەکوو یابوو ئەیحیلان

بە دەسەوبرد کەوتە فریا
بێجگە لەمە چارەی نەما

شاهەنشاه و سەیدە رەئیس
دوو چڵکاوخۆر، نەگریس و پیس

بە تەگبیری رێویە پیرە
بردنیان بۆ "الجزیرە"

هەر دوو کۆیلەی دا بە ئاشتی
شۆڕش کوردی کوشت و ناشتی

*

# ئاواتی دڵ

خۆزگە تا ماوم شەوێ لە خەوما
ئەبووم بە خاوەن دنیا تا شەبەق

شەرتە بە شەرتی پیاوی بە شەرەف
بە یەزدانی پاک بە رەببی فەلەق

دارم دائەخست لە دەستی زۆردار
هەقم دا ئەنا، لە جێگەی ناهەق

دەسم ئەنا بین خوێنمژ ئەمتاسان
فەقیرم ئەکرد بە خاوەنی هەق

روونم ئەکردۆ درۆ و دەلەسەی
سۆفی چاو قونجاو، دەروێشی چاوزەق

دز و دەسبڕ و چەتە و جاشەکەر
هەمووم بەجارێ، ئەدانە بەر شەق

تووی زەویخۆرم ئەبڕی لە بیسات
گشت کەسم ئەکرد بە خاوەن نەسەق

نوێنی جوانم ئەدا بە هەتیو
نەمئەهێشت بنوێ لە سەر عەرزی رەق

زۆرگۆم ئەخستە ژێر باری گران
هەتاکوو ئەیوت "أللهُ صَدَق"

نەمئەهێشت برێک چاخ بێ بە لەوەڕ
برێک لە برسا بێ بە چەرمەڕەق

نەمئەهێشت زانا کەوێتە کوژبن
هەمە کارە بێ نەفام و ئەحمەق

ئەوەی کە فەتوای ناحەقی ئەدا
چەرمیم دەق ئەکرد وەک چەرمی لەقلەق

ئەوەی بەرنامەی ژینی ناهەق بوو
ئەمتۆپان هەتا پێی ئەنا لە هەق

نەمئەهێشت برێک تەلارنشین بێ
برێ لە سک عەرز وشک و بێڕەمەق

کارێکم ئەکرد هەتاهەتایە
کەس تووڕە نەبێ لە قسەی نەستەق

جا بمزانیایە ئەم دنیا جوانە
بەهەشتێ نەبوو پڕ شەوق و شەبەق؟!

*

# هەواڵی شاعیر

ڕۆشنە لە لام زۆر باش ئەزانم
ڕێبواری ڕێگای دێی خامۆشانم

فریشتەی جوانی لە من تۆراوە
جنۆکەی پیری بووە بە میوانم

زۆری نەماوە بگەمە مەنزڵ
جێ بێڵم مەئوا و منداڵەکانم

ئاخۆ لەدوای خۆم ببێ و ڕێکەوێ
کەسانێ بڵێن داخی داخانم!

یا خۆ لە کاتی بیرەوەرییا
چەپەڵ باسی کەن ناو و نیشانم

کاتی باس و خواس لە گۆڕی تەنگا
بە ڕەحمی خودا پاراوە زوانم

یا وەک جاندرمەی ڕووی ئەم دنیایە
چاوم ئەبەسن و بەر ئەبنە گیانم!

*

## خوا لامان دا له کەر

مەرجانەی جادوو بێ بە هاوسەرو
لیباسی گۆنی بکەیتە بەرو
خەرجی خێزانی کەوێتە سەرو
ناهۆمێد مابی لە دەشت و دەرو

*بۆ شێوی شەوێ ئەو دەرودەر بی*
*چاکترە لەوە کە تووشی کەر بی*

پیر بی تەمەنو بچێتە هەشتا
بووک بۆ چۆڕێ ئاو بچێ بە گژتا
کوڕ بتکا بە شوان لە دەر و دەشتا
هەڵتخولێنن لە خۆشی و وەشتا

*ئەویش بێ جێ و ڕێ، بێژوورەسەر بی*
*چاکترە لەوە کە تووشی کەر بی*

گەدایی و فەقر بتکا بە فاقە
لە قەرزا چەقیو تا بینەقاقە
خێزان بۆ کراس بتکا فەلاقە
دوو بڵێ شێتە و یەک بڵێ ساقە

*کز و ناهۆمێد هەناسەسەرد بی*
*چاکترە لە وە کە تووشی کەر بی*

سیل باریکو کا هەروەکوو سوزن
بە گولی و ئیسقا بی بە رموزن
بە فیتی فیتنە و درۆی درۆزن
شار بە دەرت کەن، بە دار بت کوژن

*بەم حالۆ ئەگەر خاوەن نەزەر بی*
*چاکترە لەوە کە تووشی کەر بی*

دەرکی زیندانت لە سەر دابخرێ
بێ تاوان حوکمی کوشتنو بدرێ
تاقانە کورو بە لاوی بمرێ
ماڵ و سامانو بە تالان ببرێ

*پێت ئەڵێم هەتا تۆ باخەبەر بی*
*چاکترە لەوە کە تووشی کەر بی*

❊

# شەڕنامە

رۆژێ زوقم و هەم سەرما بوو
پاڵتاوێکیش لە بەرما بوو

پێ بە کاڵە و دەس بە گۆچان
کەوتمە رێ بۆ گێگەچان

گەیمە بەرۆ هەر جۆرێ بوو
خەستە و مانوو چنگ لە گۆ چوو

لرفەلرف و لێوەلەرێ
ئادەی مامۆژ، چاییم بەرێ

لە دوای نەختێ کە حەسامۆ
لە بەر زۆپادا بووژامۆ

لە نێو دێدا بوو بە قیڕە
جنێودان و هەرا و نیڕە

لە ماڵ دەرچوین گەورە و بچووک
دیمان دوو دراوسێی عەقڵسووک

یەکێ بە ناو حەمەکەریم
ئەویان رەزا، هاوسێی قەدیم

لە سەر ئاودانی بزن و مەڕ
گەرەکیانە بیکەن بە شەڕ

حەمەکەریم وتی: رەزا
لێمی لادە شەڕ و قەزا

کەرتێتر بەم حەیوانانۆ
گوزەر کەی تۆ لەم بانانۆ

دنیا بەم حیزییە ناژی
یا ئەوکوژم یا ئەمکوژی

لە یەک برا دار و پردو
بۆ وا ئەکەی هەی سەگ مردوو

رەزا وتی: ئەم بانانە
وشکە بۆ ئەم حەیوانانە

خوارۆ قورە لێی دەرناچم
ریتالاوی ئەبێ قاچم

حەمەکەریم کردیە هەرا
چوو بە ژوردا لە بۆ تێلا

تاوێ دایە کلکە بێلێ
مێشکی رەزا هیچ نەیەلێ

رەزا هەروا بە ئاسانی
تێلای لە دەسی دەرهانی

دای بە سەریا سەری شکاند
هەر دوو رەگی ملی پساند

دوو پرخەی کرد درێژ بۆی کەوت
رەزا داری لە دەس داکەوت

بوو بە گریە و شین و رۆڕۆ
حەمەکەریم ئای برا ڕۆ

ژن و پیاو بە یەکجاری
وەک تاوە تەرزە داباری

هەریەک بۆ کۆمەکی لایە
هەڕای ئەکرد ئەتوت بایە

بە سەری ڕووت بە پێپەتی
شەڕ بوو بە شەڕی عەشرەتی

هەر لەو لاوە سمە گلە
هەڵیەخستۆ وەک داملە

هەر لەولاوە قالە ناوە
ئەتوت لە دوای گەل جێماوە

هەر لەولاوە حسەینە بۆرە
ئەتوت هەنگە و داویە پۆرە

هەر لە ژێردا بلە ماچۆ
ئەتۆ لاچۆ، ئەتۆ لاچۆ

ئانە چێشا و چێش بیەنی
سەرەوژوور هات هەر نەیبینی!

کوڕ رەحمانی باوە حەمە
هاتە دەرۆ وەک تا دەمە

هـەر لـە ژێـردا فـەجـە وەسـە
خـۆی و خوشـکی ئەسـێ وەسـە

ئـەحا شـانێ ئـەحا کوڕنـوو
بـۆ شـەڕ کـردن لـە سـەر بیـانوو

خولـە عەبـە و خونچـە حـەنێ
مینـە شـەل و دایـە رەنـێ

حەمـە شـوکرە و رەحیمـە سـڵە
ئافتـاو بـە خـوا ئـەتـوت گوڵـە

مامـە ئـەحمـەد بـە ڕەوتـی سـووکی
سـەعای کـوڕی و عەلـەی بـووکی

هـەر خـۆی ئەکوشـت داخـی قـەویم
کـاڵێی ژنـی حەمەکـەریم

ئـەو عەشـامە گشـت بـە یـەکجار
بـەربوونـە یـەک بـە بـەرد و دار

چـەن کەسـێکیش ناوجیکـەر بـوو
تـەقالایان بێسـەمەر بـوو

بـە نـاوبژی شـەڕ نەوەسـتا
هاواریـان بـرد بـۆ مامۆسـتا

مـەلا خێـرا بـە دەسوبـرد
هەسـتا سـەر پێ خـۆی گورجۆ کـرد

قورئـــانی نایـــه ســـەر ســـەرۆ
بـــە ســـەڵوات دان هاتـــە بـــەرۆ

هـــاواری کـــرد: ئـــەهلی ئیمـــان!
بیکـــەن بـــە خـــاتری قورئـــان

یـــەکتر مـــەکوژن جیـــا ببنـــۆ
ئاشـــتی بکـــەن ئاشـــتۆ بنـــۆ

خـەڵکی چاویـان بـە قورئـان کـەوت
هـــەموو داری لـــە دەس داکـــەوت

لەبـــەر خـــاتر کـــەلامـــی خـــوا
گوریزیـان کـرد گشـت بـەرە و دوا

شـــەڕ کـــوژاوە خـــەڵکی ســـرەوت
حەمەکـەریم دوو مانـگ بۆی کـەوت!

*

# بۆچی ناخەوم

نازانم ئەمشەو بۆچی ناخەوم
لە داڵغە و خەیاڵ ساتێ ناکەوم

نازانم بۆچی خەوم رەویوە
دنیای سەنگینم لە سەر سەپیوە

گوایە من ئەبێ ئەمشەو بێدار بم
بۆ روونی شەبەق بەئینتیزار بم

ئەبێ وەک نەخۆش تەنگی دڵم بێ
لە نێو جێگەما تلاوتلم بێ

وا دیارە ئەبێ ئەمشەو بێدار بم
زووخاو هەڵڕێژم تۆزێ رزگاربم

چوونکە شەو وەختی سکاڵای دڵە
وەختی شیوەنی بولبول بۆ گوڵە

جێی راز و نیاز ئەویندارانە
کاتی ناڵە و شین دەردەدارانە

*

# جووتیاری و فەلا

ئەڵێن کە کاسب حەبیبی خوایە
ئەمە حەدیسە و راستەکەی وایە

بەڵام کاسبی کە جوراوجورە
لە نێو کۆمەڵا ئەنواعی زۆرە

کڕین و فرۆش یا خۆ حەماڵی
کارخانەداری هەتا بەقاڵی

شوانی و رەنجبەری، چەرچی و تاجری
دارتاش و جلدور، یا خۆ شاتری

نۆکەری و گزیر کوێخای ئاوایی
خادمی و سواڵی، یا خۆ مەلایی

ئەمانە و بڕێ پیشەی جۆربەجۆر
هۆی ژینی کۆمەڵ؛ زۆردار و بێزۆر

لە نێو هەمووانداپیشەی فەلایی
لە هەموو زۆرتر خاوەنی بایی

چوون کار فەلایی بێفرۆفێڵە
بێسوێن، بێدرۆ و بەبێدغێڵە

فەلای سینەساف بە دڵی بەسۆز
ئەرەق ئەڕێژێ بۆ گەل و بۆ هۆز

تەنیا ئومێدی هەر بە خووایە
بەهەشت بە بێشک جێگەی فەلایە

خۆی و جووتی گا و ماڵ و منالێ
تەقالا ئەدەن بۆ کشت و کالێ

بەرهەمی فەلای خاوەن دەخڵ و دان
سوودی لێ ئەبا هەموو چینەکان

تۆم ئەوەشێنێ ئەیداتە دەس خوا
ئەڵێ ئازاد بێ هەرکەس لێی ئەخوا

لە سەرمای پاییز لە تۆفی زستان
لاسامەی بەهار، خۆری تابستان

ئیش ئەکا و زەوی بە گا ئەکێڵێ
هەوڵ ئەدا عەرزی بایر نەهێڵێ

وەختێ سەوز ئەبێ بە بێپشوودان
خەریک بژار و شەوپات و ئاودان

درەو پێ ئەگا دەس ئەداتە داس
دروێنە ئەکا بە تۆی یەک کراس

دڕک بۆ دەسی، ئارەق بۆ چاوی
گەرما ببڕە هێز و هەناوی

درەو تەواو بوو بۆ کێشە و گێرە
خۆی ئەپڕووکێنێ، ئەڵێ سا دێرە!

دوای کێشە و گێرەی پڕ لە مەینەتی
ئەمجارە خەرمان نۆرەی شەنیەتی

شان و قۆڵ ئەکوتێ ئارەق ئەڕێژێ
خەرمان سوور ئەکا بە کەو ئەیبێژێ

بەرهەمی جووتیار بەشداری زۆرە
بەشی خۆی ئەبا هەرکەس بە نۆرە

لە پێشا دەدرێ ئاغا و زاوتانە
بەراتی مەلا، خادم، کوێخانە

زەکاتی شەرعی خۆ ئەوە دیارە
بە بێ قسە و باس بەشی هەژارە

کاتێ خەرمانپێو خەرمان ئەپێوێ
بەش خۆی دائەنێ ئەویش ئەیکەوێ

ئەمجا خەرمانلۆخ، دوای ئەوە شوان
سەلام مام حاجی، مزەی ئاشەوان

لەمانە هەرچی جێما بە جەواڵ
جووتیار باری ئەکا ئەیباتۆ بۆ ماڵ

هەرچی جێ مابێ لە نێو کوتەلا
راتبەی فەقێیە و بەراتی مەلا

ئەمجا سەرلەنوێ فەلای بێچارە
لە بۆ وەرزێتر ئامادەی کارە

*

# مەڕ و بەرخ

ئێوارە وەختێ خۆر نەما لە جێ
رانی ئاوایی رووی کردە ناو دێ

هەر لەدوور مەڕێک بەجەخت ئەیباڕان
لە کەلەخانیش بەرخێک ئەیقاڕان

تمەس ئەو بەرخە، هی ئەو مەڕەیە
ئەیزانی دایکی لە هاتنەوەیە

مەڕی بەستەزمان چووە نێو حەوشە
دڵی بۆ دیتنی رۆڵەی پەرۆشە

لە دەرکی گەوڕ فرە باڕانی
ئەیویست بیبینێ رۆڵەی زیندانی

زۆر بە تاسەوە چووە بەر چەپەر
هاکا بۆ رۆڵەی رۆحی بێتەدەر

ئەم لە نێو حەوش و ئەو لە کەلەخان
لە بۆ یەکترین هەرچێکیان باڕان

کەس رەحمی نەبوو گوێیان پێنەدان
مولاقات مەمنوع بوو بەرخی زیندان

مەڕ کە ئەیزانی هەرچی تێکۆشێ
بێسوودە، ئەبێ کابان بیدۆشێ

کەس نییە لە خوا و ویجدان بترسێ
دادی هەژار و فەقیر بپرسێ

گوێ لەم هاوارە، کەڕ و کەساسە
هەتا شیری ئەو ئەچێتە کاسە

بە ناعیلاجی جا لە ناڵە کەوت
فرمێسک لە چاویا تکتک دائەکەوت

بەم حاڵە وەستا تا کابانوو هات
بازەم هەر وەستا تا نۆرەی ئەهات

ئەمجا کێشرایە سەر کاسە بە شەق
شیریان دۆشی و مەمکی بوو بە چەق

لەم کاتا ڕێگای کەلەخان باز بوو
بەرخی دیلکراو بە دایکی شاد بوو

زۆر بە تاسەوە کەوتە ڕێ بەڕەوت
هات بە دووچۆکا و لە دایکی هەڵکەوت

وەختێ کە مەمکی دایکی گرت بە دەم
ڕوانی چەق بووە، دۆشیاوە سەرجەم

بەرخۆڵەی ناکام هەڵسایە سەرپا
ڕووی کردە دایکی و وتی: مەرحەبا

پرسیارێکم هەس ڕاسم پێ بێژە
مەڵێ ڕۆڵەکەم نەفامە و گێژە

ئایا دایکانی ئەم سەر دنیایە
ڕەحم و بەزەیان هەروەک تۆ وایە

بەختی کام ڕۆڵە وەک هی من ڕەشە
کێ وەک من لە ناز دایک بێبەشە

هەروەک فرە سات ناکەومە بیرت
ژەمێکیش نەبوو تێر بم لە شیرت

مەڕ وتی ڕۆڵە فامت بۆ وایە
سەرتاسەر دنیا هەمووی هەروایە

کاری سورشت و دنیای غەدداره
چینێ بەشخوراو، چینێک زۆرداره

ئێمە ژێردەسەی پیلان و داوین
کوشتەی خوێنمژ و بەدبەختی ناوین

بنە و بنەچە، هەموو هەژارین
دیلی سەرپەنجەی کاک ئیستعمارین

ئەمن چی بکەم لە پووره خۆشێ
شیرەکەم ئەبا و بە شەق ئەمدۆشێ

ئەمیشە باشە دەردێ گرانتر
وا لە ڕیمانا فرە خراپتر

ساڵێ دووکەڕەت تەواو جوان و پاک
ئەمانبرنۆ بۆ بەرگ و پوشاک

لەودوایش زانیان ئەوا پیر ئەبین
ئەماندەنە دەس قەسابی بێدین

بێ بەزە و ڕەحم سەرمان ئەبڕن
بە کاردی دەمتیژ سکمان ئەدڕن

هیشتا هەر زینووین پێسمان ئەکەنن
لیباسی ژینمان لە بەر دائەڕنن

ئاغای پارەدار لە گۆشتمان ئەبا
هەژاریش ئیتر با بە زگیا دا

بەرخ وتی: دایە! جا مادەم وایە
با بچین بۆ جێی کە پیاوی تیایە

مەڕ وتی: ڕۆڵە وازم لێبێنە
جەحارم زۆرە دەردم مەدوێنە

بۆ لای هەرکەس چین ڕۆڵە بە مەرگت
دوای بەینێ ئەویش ئەبێ بە گورگت

ئەمە نیشانەی دونیای غەدارە
هەرچی هەژارە تیکەی سەردارە!

*

# پیری دەسگیر[٢٤]

پیـــری دەســـگیرم ســـەرکۆماری دیـــن
ســـەرچاوەی کـــانی ســـازگاری ژیـــن

رانمـــای شـــەقام بـــۆ شـــاری ئـــەوین
تاقانـــــەی نـــــازار بنەماڵـــــەی دیـــــن

لـە قـاپی تـۆدا هەرکـەس جێـی دەسکەوت
بە بادەی عەشقی ئەزەڵ سەرمەس کـەوت

سەرخۆشـی وەهـا بێخـود لـە هەسـتی
وازهێنـــەر نییـــە لـــە مـــەیپەرەســـتی

لـــەو بـــێخودیـــا ئـــەچێ بـــۆ هەســـتی
ئەنێتـە ژێـر پـێ، گشـت بـەرزی و پەسـتی

بۆ سـەرکەوتنی کۆشـک و سـەرای غـەیب
خزمـــەتکارانی بێریـــا و بێعـــەیب

تیـــپتیـــپ عـــازمی خـــەڵوەتخانەیـــە
شـــــانی فریشـــــتە پلەکانەیـــــــە

شـــانازی مـــاڵ و ملکـــی تەریقـــەت
شـــارەزای دۆڵ و شـــیوی شـــەریعەت

خـــۆ منـــیش بـــەینێ بەیعـــەتکارت بـــووم
لـــە ئاســـانەکـــەت خزمـــەتکارت بـــووم

---

٢٤. حەزرەتی شێخ عوسمان سیراج الدینی ثانی پێنوستیە خەلاتی شاعیر ئەکا و
فەرمێ: پێنوسە کە تاقی کەرەوە بزانە باش ئەنووسێ، شاعیر لە تاقی کردنەوەی
پێنوسا ئەم شێعرانەی بۆ دێ.

نــابێ بگــەیین بـــە عـــیلم و عیرفـــان
هـــەر پێنووســـەکەت بخەمـــە گیرفـــان

تـــۆ کـــە ســـەرتاپای قامـــەتت نـــووره
ئەفـــــەرمووی ئیســـــتا فلانـــــی دووره

هەرچـەن لـە حەڵقـەی بـەزمت مـن دوورم
بـــەڵام هـــەر مـــاوە فـــام و شـــعوورم

پێنووســــــت رازی دڵـــــم ئەنووســــــێ
چـاوم بـە فرمێسـک دورریـت ئەخووسـێ

هـەرکات ئـارەزووی خزمـەت بێتـە بـەر
لـە لوولـەی دەروون دوکـەڵ دێتـە سـەر

رجـام ئـەوەیـە شـای شـیرین کـەلام
لـــە بیـــرت نـــەچم، بـــاقی والســـلام

*

# عەیش و نۆش

ەندە بە عەیشی، چەندە بە نۆشی　　تازەم زانیوە، عینوان ئەفرۆشی
خرخاڵی خرخاڵی　　ناسک و نۆڵو منداڵی
کیژێ شەڵا تۆم بوایە　　دوو شەوان بە حەڵاڵی

ەلاوێژەکەی، زۆر نازارەکەم　　ئەستێرەی ئاسمان، پرشنگدارەکەم
بە ناخوونی لاکاوی　　بە تیری موژەی چاوی
منی خستە نێو داوی　　گیان دەرنابەم لە راوی

ەڵێم کە هاتی، دەردی دڵەکەم　　لات ئەدرکێنم، تاقە گوڵەکەم
بەڵام وەختێ هەڵاتی　　وەک مانگی چواردەشەوێ
زوانبەسرا و چاونوقاو　　دڵ و ناوک ئەکەوێ

خۆزگا بۆ جارێک، تەنیا من و تۆ　　رێکمان خستایە، بەزمێک سەربەخۆ
لە چیمەن و گوێی ئاوێ　　هەروەک جووتە زین ومەم
بە ئاسوودەیی تاوێ　　دەس لە مەم و دەم لە دەم

❊

# داره بن

داره بنـــیٚکم کـــز و بیٚچـــاره
بــۆ خـــۆم رواوم لـــەو لانـــزاره

لــق و پـۆپ وشــک و گـەڵا نیـوەزەرد
ئـــارامم نییـــە لـــە بـــەر ژان و دەرد

لـــە نـــاو دارانـــا مـــن چـــارەڕەشـــم
هـــەموو برینـــە ســـەرتاپای لەشـــم

جیٚگـــای ژیـــانم وا لـــە لاپاڵـــە
مۆڵگـــەی پاتاڵـــە و ریٚگـــەی ئاژاڵـــە

هیٚشـتا نـەمام بووم، شـلک و گـەڵا شـین
زۆر شـایی بـە خـۆ، هیـوادار بـە ژیـن

پـیٚم وا بـوو ژیـان گشـتی شـادیە
ئەلـــەریام بـــە شـــنۆی ئـــەو ئازادیـــە

لای مـــن درۆ بـــو زۆردار و بـــیٚزۆر
بـۆم ئەفسـانە بـوو بزنـی چـرۆ خـۆر

بـــەڵام زەمانـــە بـــاش تیٚـــی گەیانـــدم
لـــەو خـــەوە خۆشـــەم زوو رایپەڕانـــدم

بـــزن قرتـــانی ســـەر و گـــویٚلاکم
گیٚســـک ئەیکروشـــت پـــوز و لـــوولاکم

بـــوو بـــە بـــەفری شـــیاوی و نـــەمام
جیـا لـە چەنـد رەگیٚـک لـە هـەردا نـەمام

لە ناوی بردم شەمامی وا جوان
پشووشی نەدا بە بلوێری شوان

زانیم بەزەیی ناوێکە بەدرۆ
تا بزن هەبێ هەر سیسە چرۆ

گەلێک ساڵی دیش ئەڕوام دووبارە
تەماشام ئەکرد ئەمساڵیش پارە

بەڵام هەردیسان لە سەرخۆ هێدی
هۆمێد بەهێزتر، لە ناهۆمێدی

تا هەڵمئەدا هەر ئەخورامەوە
زۆر بە سەرسەختی هەر ئەڕوامەوە

لە دەرفەتێکا هەڵم وەدەس خست
دور لە مەڕ و شوان باڵا چووم بستبست

روام هەر روام بوومە گەورەدار
دارێ بەهەرەدار، بێ ئەرک و ئازار

نە چقڵم هەڵگرت، نە رێگر لە کەس
هەر شین ئەبوومۆ زۆر ئەبوو مەبەس

هەر ساڵ بەرەو من بای ئەدایەوە
خەڵفم بە قەزوان ئەڕازایەوە

کیژ و کوڕان شۆخ، مناڵانی وورد
میوانم ئەبوون قەزوانیان ئەبرد

خەڵفە و مێوەکەم، دیاری دەزگیران
پیرەکەم ئەبوە تەزبێحی پیران

لــه حیلکــه و گــەمان لــه خرمــەی دەمــان
گـــەش ئەبوومـــەوە و خـــەمم ئـــەڕەوان

دەشـــــنیامەوە لەگـــــەل شـــــنیای ئـــــەو
سەرخۆشمی ئـەکرد قاسپەقاسپەی کـەو

رۆژێک هەشتەمـی سێهەم مـانگی سـاڵ
روانـیم وا لـه دوور، پیـاوێکی خـوێنتـاڵ

دابوویـه بـەر پـاڵ بـەرەو مـن ئـەهات
هـەنگاوێک ئـەنێ و دووجـار تـل ئـەدات

بـه ئوحـۆی ئۆحـۆی و بـەڵغم فـڕێ دان
بـــه ئـــارەق ســـڕین، چڵکـــن و بـــێدان

گـۆزەڵـه ئـاوێ، ئـەم دەس بـۆ ئـەو دەس
نۆبـەی پـێ ئـەکا بـه دوو سـێ نـەفس

یـــەخـــه دادڕاو رانـــک و چۆخـــه شـــڕ
لـــه خـــۆی بەســـتوە پـــڕ جـــەواڵێ قـــوڕ

تەشـــوێیه دەمپـــان تـــازە دەمـــەزەرد
بـــه کەمەریـــەوە بـــۆ ئـــازار و دەرد

هەناســـه بڕکـــێ گەیشـــته لای مـــن
سـەیرێکی کـردم وەک سـەیری دوژمـن

کۆڵـــه قوڕەکـــه و گۆزەڵـــه ئـــاوی
لـــەولاوە دانـــا بـــه حەپەســـاوی

پـــاڵی پێـــوەدام کیســـه و قلیـــانی
لـــه بـــەر، پشـــتێنی شـــڕی دەرهـــانی

ئەوسا قلیانی لە تووتن پڕ کرد
بە پیف و چەخماخ ئاگری هەڵکرد

مژێکی لێدا و لەقاندی سەری
تۆزێکی روانی لە دەورووبەری

ئەم مژ تا ئەو مژ، دەس لە بنا گوێ
ئەیلۆراندەوە بەندی کۆنە و نوێ

دەم لە ناو دەم و دەس لە مەمانە
وەلێ بێ، خانم بێ، سیاچەمانە

لە ناکاو هەستا و لە بەژنی روانیم
زانیم، پەیدا بوو، دوژمنی جوانیم

دەستی راستی کرد وەبەر پشتێنا
لە لای پشتەوە تەشوێی دەرهێنا

بەرەو بنجی من هات بە رووتاڵی
مێشکی گەنیوی لە ویژدان خاڵی

قەڵتووبڕی کرد بەژنم بە تەشوێ
دادی بێچاران چۆن ئەگاتە گوێ؟!

گەلێک برینی گەورەی لێ کردم
لە ژان و دەردم سەیرە نەمردم!

تۆپە قوڕێکی هێنا هەڵشێلاو
شلی کردەوە بە لاوێچی ئاو

کاسەی قوڕی کرد لە ژێر برینم
ئەیگوت ژانی تۆ هۆیە بۆ ژینم

لە چۆڵ مامەوە بەو لەشی پڕ زام
بە هیچ کەس ناگا هاوار و نزام

لە لای چەپەوە لە لای راسەوە
فرمێسک و خوێنم ئەڕژا کاسەوە

کاسە گڵ پڕ بوون لە خوێناوی من
دڵۆپەی بڕا ئاوی چاوی من

پاش مانگێ کابرا هاتەوە بۆ لام
وەک جاری جاران سەرنجێکی دام

تەنەکەییێکی شکاوی پێ بوو
لە چواردەورم چەند کاسەی لێ بوو

بەم دەس و بەو دەس خێرا دەسوبرد
خوێنەکەی منی لە تەنەکە کرد

کە زانی زۆرە، زۆر گەشایەوە
بە هەنگاوی توند بۆی گەڕایەوە

خۆی رۆی و خوێنی لەشی منی برد
نازانم بۆ کوێ، یا خۆ چی لێ کرد؟

ئیتر ئەم حاڵە لە من بوو بە باو
بوو بە ژیانم وەکوو هەوا و ئاو

ئەوە پێشهاتی ساڵە و ساڵمە
هەموو بەهاران ئەمە حاڵمە

خوێنی لەشی من ئەگرن و ئەبەن
ژینی خۆیانی پێ دابین ئەکەن

بیـــر نابـــەن منـــیش خێـــوی ژیـــانم
بـــۆ ئـــازارم ئـــەدەن خـــۆ بێزیـــانم

ئـــەوە کـــەی دینـــە و بـــەزە و ویژدانـــە
بـــۆچی شـــیوەنم جیژنـــی ئـــەوانـــە

کـــێ ئـــەڵـــێ بـــەوەش وازم لێـــدێنن
ڕۆژێـــک ئـــەمبڕن و ریشـــەم دەردێـــنن

پـــاش ئـــەوەی خـــوێنم نـــەما بیمـــژن
یـــک بـــە دووان ئـــەڵێ بـــڕۆن بیکـــوژن

تـــەوەر بـــە دەســـت و بیـــور لـــە شـــانێ
گـــوریس لـــە پشـــت و هەمبانـــە نـــانێ

تفـــەنـــگ دســـتێک و چەنـــد نقـــە ومـــڕین
زۆرم بیســـــتووە تـــــەقی داربـــــڕین

دەمکـــەن بـــە خـــەڵووز یـــان بـــە بـــارەدار
دەمبـــەن بـــە دیـــاری بـــۆ پیـــرەژن شـــار

ئێســـــتا دەبیـــــنم وا خۆڵـــــەمێشـــــم
کەوتوومـــە بـــەر پـــێ و ئـــاخ هەڵئەکێشـــم

*

## شەڕی ئێران و ئێراق

هەشت ساڵ لەمەوبەر، کافرێکی خول
سەری لێشێواو، تەوقی چوە مل

بێچاوساخ کەوتە هەنگاو کوێرانە
وەک بۆ ئەوین‌دار چۆڵە و وێرانە

بە خیاڵی خۆی سکزلی پێ‌پان
پاش رەزا چۆڵە و وێرانە ئێران

ئەیویست کە بۆ خۆی ناودەربهێنێ
گوایە لە ئێران تۆڵە بستێنێ

بە شەڕ فرۆشتن لە تەک ئێرانا
ناوی دەربکا لە نێو جیهانا

کەس نەبوو بڵێ داکەوە بۆ خۆت
گۆڕ هەڵمەکەنە بە دەس خۆت بۆ خۆت

خۆت بۆ ناگیرێ تۆ لە مەسافا
مێشولە، مەچۆ بە قولەی قافا

ئاخۆ بە چی تۆ خۆتت خول داوە
بە چ زۆرێکۆ ئەسپت تاو داوە

نە خاوەن‌تەگبیر، نە دارای نامی
نە رێویە پیرەی، نە مامە سامی

ئەگەر بەمانۆ شانازی ئەکەی
بزانە تەک دەم شێر بازی ئەکەی

بۆ وا وەرەقەت لەلا گۆڕیاوە
مام سام و رێویش هەر دوو دۆڕاوە

لــه ســهرزهمینــی پــاکی شــهیدان
وشـتر تـاو مـهده سـهرخڕی گوێ پـان

هۆشـت لـه خـۆت بـێ ئهخریتـه کـهنـاو
لـه ژیـن سـهر ئـهدا لافـاوی خوێنـاو

فریــب نــاو مــهخۆ نــاوت ســهدامه
واتــهی ناوهکـهت خـوێنڕێـژ تهمامـه

خـوێنی ئهرتهشـێ بـه تـۆ نـاڕژێ
مـهر لـۆتی دهروێش، غـهیرهز تـو بێژێ

نـاڕژێ بـه تـۆ بـێموخی نـهفـام
خـوێنی ئهرتهشـی وسـوپاهی ئیسـلام

نـارژێ بـێتـهگبیر بێڕاوێـژ بێبیـر
بـێپشـتیوانی هاوڕێیـهکـی ژیـر

هـانیدا برێـک تکریتـی عـهرهب
کهوتنـه رێگـا بـه شـهوق و تـهرهب

روو وه بێشـهڵان شـیرانی ژیـان
وهک یـهکێ بێـزار بـوو بێ لـه ژیـان

واتـه هـهرێمی سـوپای رهزمهنـده
ئهرتهشـی بـههێز دوژمـن کوشـهنده

دوو سـێ فڕوکـهی خسـته رووی هـهوا
چـهن راکتێکیـان بێهـهدهف تـووڕا

وایزانـی ئیتـر بـهم دوو سـێ بۆمـه
مـهڵبهنـدی ئیسـلام بـه خوێنـاو گۆمـه

سنووری شکاند به جەسورانە
بە پێی خۆی هاتە نێو قەسابخانە

رەزمەندەی ئیسلام کە وەختێ روانی
دوژمن کەوتۆتە سەر رەجەزخوانی

سەدام و بەعسی هەر دوو بە پەلە
بە پیاڵەی ئاو، کەوتوونە مەلە

خوێنی سپاهی لەتەک ئەرتەشا
لە نێو قازانی غەیرەتا جۆشا

پیاوانە هەڵسان قۆڵیان هەڵماڵی
وەک لافاو درک و داڵیان داماڵی

دوژمنیان شکاند تەواو بەگشتی
یا بە دیلگرتی، وە یا خۆ کوشتی

سەدام کە زانی وا هەوا پەسە
نە هێزی وەستان نەچارەڕەسە

پەنای برد بە سوڵح یا بۆ کەیخوا
هانا بردن بۆ پیاوی خێرخوا

رێخراو نەتەوەی یەکگرتووی وڵات
خوێندن قورئان و حەدیس وئایات

چوون بۆ کەربەلا، نەجەف، کازمەین
راوێژ و تەگبیر، تەک فەهەد و حسەین

چوونە مزگەوتی شاری خانەقی
بۆ نوێژ خوێندن بە منافقی

تــا قــەتعنامــەی ملــەل بــۆ ئاشــتی
ژمــارە پانســـەد و نـــەوەد و هەشـــتی

دەرچــوو بــە شــوێنیا کــرا ئاوربــەس
ئــەمجا ســەدامــی خــوێنڕێــژی ناکــەس

جــا ســەدام چونکــوو خوانــەناس بــوو
لــە و تــرس و لــەرزە کــەمێ خــەلاس بــوو

کـــەمکـــەم گەرەکیـــە بـــاقی بســـێنێ
بـــە جـــۆرێکی‌تر تۆڵـــە بســـێنێ

نافـــامێ ئەگـــەر خولاســـەی کـــەلام
مـــل ڕانەکێشـــێ لـــە عاســـتی ئیســـلام

هـــەموو زیـــاوەس ئـــەم قێـــڕە قێـــڕە
"ماســـی هـــەر وەختـــێ بیگـــری تـــەڕە"

لـــە بـــۆ تەڵەیـــە کـــە پێـــوە بـــووە
ڕێگـــای فـــەراری وا لـــێ وەن بـــووە

*

# گلەیی و قەسەم نامە

یا حەیی داوەر، یا حەیی داوەر
یا دروسکەری جگەرەی شاوەر

یا روخێنەری بنەماڵەکان
سەرگەورە و رەئیس گشت بەتاڵەکان

یا کوژێنەوەی ئاوری وەجاخ
یا رۆشنکەری تاڵی قوڕمساخ

کەریمی کەرساز کار بە دەس آسان
چەند خانەدانت لە برسا تاسان

چەندە سەرچاوەی روونت کوێرۆ کرد
چەن میرەماڵت سەروژێرۆ کرد

چەن فیلەسووفت مراند لە داخا
دەستی چەن ژیرت چەقان بە زاخا

چەن زانا و ئەدیب، بە داخەوە مرد
تو خوا پێم بلێ، بزانم چیت نەکرد

بە خۆت ئەکەوێ ساحیب دەسەڵات
فەوتانی نەجیب، تەرەفی بە لات

هیچکەس ناتوانێ وەک تۆ کار بکا
خەلیفە حەبیب فێری غار بکا

ئـازا حیز ئەکـەی، حیـز ئەکـەی بـە مـەرد
دەســـەڵات ئــەدەی بـــە پیـــاوی نامـــەرد

شـاخ ئـەدەی بـە کـەر، بـزن کـۆڵ ئەکـەی
فاسـق دیـن درووس، حـاجی زۆڵ ئەکـەی

کـــار ئەســـپێری بـــە ســـەگ و ســـووتک
ئەمانـــەتی دووگ، ئـــەدەی بـــە کتـــک

دەسڕەنجـــی فـــەقیر ئـــەدەی بـــە زاڵـــم
دادی ناپرســـــی، هــــەرەس بـــــە مـــــاڵم

نـــەجیب و شـــەریف بێکـــاری ئەکـــەی
لـــە چلـــەی زســـتان بـــێداری ئەکـــەی

عـــومرێکی درێـــژ مـــن هـــەوڵم داوە
لـــە فرمـــانی تـــۆ ســـەرم ســـوڕماوە

ئـــەوەی دڵـــی بـــۆ ئـــەولاد بجۆشـــێ
پێـــی نـــادەی ئەگـــەر دنیـــا بخرۆشـــێ

یـــا ئەگـــەر پێتـــدا زوو لێـــی ســـناوە
بـــە وەجـــاخکـــوێری ســـەرت پێنـــاوە

ئـەوە تـۆ ئەیکـەی نایـە لـە هـیچ کـەس
کەس کەی بە ناکەس، ناکەس کەی بە کەس

ئـــەوە ئەیکـــەی تـــۆ، وا لـــە بـــەر پێتـــە
مـــن بمکردایـــە ئـــەتـــوت پـــێم شـــێتە

قەســـــەمت ئـــەدەم ســـاحێب دەســـەڵات
بــە هــەموو لایــە، لــە رووی سەربیســات

قەســـــەمت ئـــەدەم بـــە تـــاڵی زاور
بــە قوڵتــەی دیــزە لــە ســەری ئــاور

بـــە فـــرەڕێســـی و چەناكـــەی شـــكاو
مـــارفی دەملـــەق، بیَوەخـــت و ناكـــاو

قەســـــەمت ئـــەدەم بـــەمانـــە هـــەموو
بــە ســەر و گــوێلاك "كــەری نــاو پــەموو"

ئەوەنـــدەی تـــۆزێ رەحـــم بـــە حـــاڵم
گەشـــەیە بـــدەی بـــە پـــرژ و بـــاڵم

ســـوار ماشـــینم كـــەی تێكۆشـــم بـــە دەو
لــە دەربــەن دزڵــی تفــەنــگ خــەم لــە كــەو

ئــەمجا لــە دزڵــی لــە بــەر مــاڵ حــاجی
وەرگــرین ماســت و هــەم نــانی ســاجی

لــەودوا ســەركەوین بــە چەنــد كشــەفــش
لــە كۆڵانەكــە دەس كــەین بــە كــش‌كــش

لـــەودوا جـــیَ بیڵـــین مەیـــدان گوڵاڵـــە
نەوەســـتین یـــەكشـــەق هـــەتا كەماڵـــە

لـــە بـــەینی رێـــدا لـــە خـــوار و لـــە ژور
شـەش حـەو نێـرەكـەو خـەین لـە تـەوتلور

ئەمجار سەرکەوین بۆ پۆپەی لووتە
دووربینێ بخەین لە بانی تەتە

لەودوا جادەکە سەربەرەوخوارە
نەوەستین هەتا سەر حەوزەلارە

لەوێ پشوویە، کەبابێ، ئاوێ
بێئەلاقە بین لەم دنیا تاوێ

## داخی داخانم

یـــاران ڕەفیـێقـــان شـــین و زاریمــــە
لــــە بـــۆ ڕابـــوردووم بێقەراریمــــە

دڵەی کۆسکەوتووم هەر لەسەر شەوقە
بـــەڵام بـــەدەنم ســـەری لـــێ تەوقــە

وەک هـــەرزەکاریم دڵـــم بـــە هـــەواس
لـــە بـــۆ لـــەزایز دایـــم بـــە تـــەماس

داوام لـــێ ئـــەکا بـــە لـــەحزە و بـــە ئـــان
لە بەرگ، لە کردن، لە خواردن، لـە نـان

ئـــەمما وجـــوودم بـــاش تێشـــکاوە
قـــووە و توانـــایی کـــاری نـــەماوە

قـــووەی جســـمانیم لـــە لا بـــڕاوە
لـــە هـــەموو شـــتێ هـــەر دەمـــم مـــاوە

تـــەنیا زبـــانم وەک جـــاران مـــاوە
بـــۆ زەمـــی خـــەڵکی تـــەواو پـــاراوە

زەمـــی پـــێ ئەکـــەم هـــەتا بتـــوانم
چ بـــاکم لـــە دیـــن، یـــا خـــۆ ئیمـــانم

ئـــەیهۆ دەمێکـــە دیـــنم نـــەماوە
ئیمـــانم لـــە ســـەر ...م دانـــاوە

داخـــی داخـــانم بـــۆ جـــاری جـــاران
هەرکەسم ئەگرت وەک گێسک ئەیباڕان

داخـــی داخـــانم بـــۆ ئـــەو زەمانـــە
عـــەیبم ئەیقوروسکاند هـــەروەک یەکانـــە

مـــالّم هەمیشـــە پــڕ ژنـــە تـــۆراو
لـــە حاشـــاکەر و لـــە تـــەڵاقدراو

جـوان و ناشـیرین لـە هـەراو و تـەنگ
ئـاوس و قسـر، بـێهـەرا و بـێدەنـگ

لە دەورما بوون، خۆم خاوەنیان بووم
دایـــم ئامـــادە لـــە خزمـــەتیان بـــووم

دایکـــی منـــاڵان خـــۆی دەڵاڵـــم بـــوو
جارجاریش بۆخۆی وەک پێچاڵم بوو

بـۆ تـەڵاقکـەوتوو، عـەلی جاشـم بـوو
کرایـەکـەی ئـەو وەک مەعاشـم بـوو

لـەوانـە موحتـاج بـە جـاش کـردن بـوو
هـەرکامیان جـوان و خـڕ و خـرپن بـوو

دامئـەنا بـۆ خـۆم، عـەلی بـە حـەق بـوو
نیگـای کردایـە پـڕ کـوڵی شـەق بـوو

وەختێکیش بـۆ دار ئـەچوە ئـەو هـەردە
لـــە جێگـــای ئـــەوا ئەچوومـــە پـــەردە

بەرخـــە مەڕەکـــە، سـێوی دەسـم بـوو
بێـــوەژنـــەکـــان هـــەموو کەسـم بـــوو

حـــەبیبـــە نـــاوێ لـــە دوخمـــە مـــابوو
مـاوەی چەنـد سـاڵی لـە سـیغەما بـوو

*

## شەهید

بە گوێرەی ئایەی کەلامی مەجید
حەییە و نامرێ، زیندووە شەهید

ناوی لە چوار پیت بۆ دانراوە
هەریەک نیشانەی یەک شێوە و ناوە

شینی شەرافەت، هائی هیدایەت
یائی یەقین و دالی درایەت

شینت یانێ ها خاوەن شەرەفی
پەیرەوی حەق و باتڵ تەرەفی

پیتی هاء واتە هادی ڕێی حەقی
لە بۆ ڕێی تاریک هەروەک شەبەقی

یاء، یانێ یەقین ئەم ڕێگا پیا چووی
هۆیە بۆ ئەوەی نامری و زیندووی

دال ئەڵێ شەهید خاوەن درایەت
ئەم ڕێگا بگرە ئەگەی بە پایەت

جەزای خزمەتتان بۆ کەس نادرێتۆ
مَن قَضی نَحبَهُ[25]، ئێوە ئەگرێتۆ

*

---

٢٥. بەشێکە لە ئایەی ٢٣ ی سوورەی ئەحزاب لە قورئانی پیرۆز

## بەرخۆلە

لــــە دەوڵەتخانــــە پیــــاوێکی دەغـــــەڵ
کۆمــەڵێ مــەڕی مــل ســوور و کــەژەڵ

لـــە نـــاو گــەوڕێکی دار و دیــوار شــڕ
تاریـک و بچـووک سـەرد و بـێئـاخوڕ

ڕۆژان بـۆ لـــە وەڕ ئـــەدران بـــە شـــوان
ئــەبران بــۆ کــەژ و دۆڵ و ســەر هــەردان

شـــوانی لاکـــردار بێبـــەزە و ویـــژدان
سەر و گوێی ئەکوتان، بە دار، بە گۆچان

لە ژێر تاوی سوور، ماوەی شەش سەعات
مۆڵیشـــی ئـــەدان تـــا ســـێبەر ئـــەهات

بەرخۆلـــە وتـــی: دایـــە تـــۆ لـــەکوێیت
بـــۆچی دیـــار نیـــت خـــۆ بـــاوەژن نییـــت

شـــەو هـــەتا بـــەیان، بـــەیان هـــەتا شـــەو
ئـــەگریم بـــۆ دووریـــت ســـاتێ نیمـــە خـــەو

بەشـــی مـــن بـــۆچی زینـــدان و بەنـــدە
ئەمـــە کـــەی شـــێوەی دایـــک و فەرزەنـــدە

مـــەڕ وتـــی: ڕۆڵـــەم! ڕۆڵـــەی بـــەڕێـــزم!
بـــەنـــەنی جـــەرگم، توانـــا و هێـــزم!

تـــۆ خـــوا پـــێم بڵـــێ بـــۆ وا زویـــری
بـــۆچی ئەگریـــەیت لـــە چـــی دڵگیـــری؟

...

❊

## تەبێعەت

گـەل هـەموو تێکـڕا دوشـمن پێکـەنین
دەسـەمل لـە تـەک شـیوەن و گـرین

سـالّی بێبـەهار، حەوتـەی بێپشـوو
لاو بێزەمـاوەن، کیژۆڵـە بێشـوو

داری بێسـەمەر، بـاخی بێگوڵـە
پیـر و جـوان هـەروەک چۆلەکـەی چلّـە

یـەکێ ڕا ئـەکا، یـەکێ بـار ئـەکا
یـەکێ لـە ترسـا شـارە و شـار ئـەکا

دەشـتی مـەریوان بـووە بـە کـەویر
دانیشـتووانی گشـت مـات و زویـر

ئـەو دەشـتە جوانـە وەک خـۆی نـەماوە
رزق و رۆزی ئـەو تـەواو گـۆڕاوە

بـۆ هـەر کـوێ ئـەچی وەک وێرانەیـە
رەسـمی تەبێعـەت پێچەوانەیـە

*

# مامە

مامەی چەوساوەی دەس پینەپینە
تەبیعەت بۆ وا لەل تۆ بەقینە

سوچ و تاوانت بۆ بەدیهێنەر
چی بوو وا تۆی کرد پڕ لە دەردیسەر

وا دەرئەکەوێ قورسایی ژیان
پشتی کردووی بە کەفەی گۆچان

گرێک نەماوە لە شان و باڵت
هەڵپرووکاوە خێزان و ماڵت

ئایا خۆت دیوە لە نێو ئاوێنە
کە رواڵەتت چەن دڵتەزێنە؟

ناپیاویت هەبوو بۆ خەلقی خوا
وا تۆی خستە ناو ئەم دەرد و بەڵا؟

*

# زانا

نــــاوترێ زانـــــا، بـــەو ماموســـــتایە
بــە خــەڵکــی بڵــێ دەرســـی زانیــاری

زانــا ئەوەیــە لــە پــێش هــەموو کــەس
دەرس بــدا بــە خــۆی بــۆ ئاگــاداری

ئەگــــەر وای نـــەکرد ئـــەو پزشـــکێکە
گــەییوە بــە عــەرش نالــە و هــاواری

ئـەر زانـای، ئـەمن هـەر بە خۆت ئـەڵێم
کـەر نییـە کەسـێ، وا بـێ کـەرداری!؟

ئـەر ئـەڵیـی بـەڵێ و وەرئـەگری پەنـدم
ئــەمجا لــە بــەر چــی وا بــەورەفتاری

"ژاکـــاو" مەبەســـتی ئـــەو کەســـانەیە
بە چاک و میزەر خۆی کردوە دیاری!

من چو مهموزم ز عشقت سالمم با وصل تو
چون مضاعف گشته دردم دیک دل تف می زند

با دو لفین لفیف نرگس معتل تو
مرد ناقص لاف عشق از باب اجوف می زند

و مهموزم ز عشقت، سالمم با وصل تو

ون مضاعف گشته دردم ویک دل تف می زند

بادو لفین لفیف نرگس معتل تو

مرد ناقص لاف عشق از باب اجوف

## دوبیتی

من چو مهموزم ز عشقت، سالمم با وصل تو
چون مضاعف گشته دردم، دیگِ دل تَف می‌زند
با دو زلفینِ لفیفِ نرگسِ معتلٍّ تو
مرد ناقص لاف عشق از بابِ اجوف می‌زند[۲۶]

*

## تک بیتی

یار مردان خدا باش که در کشتیِ نوح
هست خاکی که به آبی، نخرد طوفان را

*

---

۲. شاید بتوان این شعر را اوج کار شاعر دانست؛ دوبیتیِ کامل که شامل محتوایی عمیق و تصویری
ق است و محمل آرایه‌های ادبیِ بسیاری است!

## روستایی

در اقشـارعالم بگشـتم بسـی
ندیـدم چنـو روسـتایی کسـی

بلی روسـتایی همـه ساده‌انـد
بشـاش و جـوانمرد و آزاده‌انـد

بگفتـار بـارد ز لبهـا شـکر
بـه کـردار دارد بـه دلهـا اثـر

همـه کـار آنهـا زراعـت بـود
همـه زندگیشـان قناعـت بـود

بنـام خـدا هستش آغـاز کـار
به امید او هسـت دمسـاز کـار

بـه گـاه پـذیرایی از میهمـان
نظیـرش نباشـد ایـن میزبـان

به بیش و کم روزی خود شکور
مصیبت اگر آیدش بـس صـبور

رود گر ستم از کسی بر سـرش
به یزدان حوالـه کنـد کیفـرش

به همسایه‌ها مهربانند بسی
فداکاریی که نیاید ز کسی

به گاه ضرورت چنان باهمند
تو گویی که کلاً ز یک مادرند

به ایثار اموال و هم جان پاک
سلحشور با دشمن آب و خاک

تو گویی خدای جهان آفرین
جدا خلق فرموده او ده‌نشین

زن روستائی فرشته بود
خمیرش به عفّت سرشته بود

همه اوستادند در کارها
درخشنده، زیبا چو اِستارها

به‌آزرم باشند همه حور عین
دهستانی برتو هزار آفرین

توان گفت ایزد به صورتگری
زن روستا ساخته چون پری

گِل این جماعت جدا بیخته
حیا و شرف را در آن ریخته

عفـاف حیـا و شـرف را ببـین
بـه زیـر حجـابِ زن ده‌نشـین

سوای اینکه او خانـه‌داری کنـد
سر مزرعـه کشـت‌کـاری کنـد

بهنگــام شــخم زمـین و درو
ز مردان به‌چـالاکی بـرده گـرو

به هر چه که دارند شـاکر بونـد
و گر چـه ندارنـد صـابر بونـد

بـرو سـیر کـن و روسـتا ببـین
مسـلمانی ده‌نشـین را ببـین

صـفات و ادای زکـاتش ببـین
خشوع و خضوع نمـازش ببـین

در اوصاف این قشر پاکیزه جان
بنان و قلم کُنـد و قاصـر زبـان

❋

# حکایت

داشت عباسقلی خان، وطنی
وطنی پر گل و باغ و چمنی

همه جای وطنش زیبا بود
زیر و بالاش پر از دریا بود

بر سرش بود ز دریا تاجی
که ز فیروزه بر آن امواجی

زیر پا داشت چه دیبا فرشی
چه گران قیمت و زیبا فرشی

در دلش پهنه‌ی دریای نمک
کوههایش همگی سر به فلک

یک طرف کوه دماوندی بود
یک طرف رشته‌ی الوندی بود

در آن جایگه هم جاه و کوه و درخت
خورده پیوند به همدیگر سخت

دست بر دامن جنگل زده کوه
برده دل را ز جلال و شکوه

آب دریا بزدی گاه به گاه
بوسه بر پای گل و سنگ و گیاه

دخترک رخت تنش رنگین بود
دامنش چرخی چین در چین بود

نرم نرمک قدمی برمی‌داشت
در دل مزرعه شالی می‌کاشت

هر گه که به سویش چو نظر می‌کردی
باغ جنت به نظر آوردی

شهر شیراز پر از راز در آن
حافظ و سعدی شیراز در آن

شهر گل، شهر ادب، شهر سراب
شهر موسیقی و آواز و کتاب

وندر آنجا می‌کرد دخترک شیرازی
با دل عارف و عامی بازی

هر چه با او بخوری فالوده
نشود دامن او آلوده

آن طرف خطه‌ی خوزستان بود
همه جایش پر نخلستان بود

بـــرده دل از همـــه کـــس کـــارونش
ســـر بـــه ســـر ســـبزه‌ی پیرامـــونش

آن طرف دیگر به جـلال و بـه شـکوه
بــود جــاری بــه زمــین از ســر کــوه

پـــر دریـــا از بلـــم‌رانـــان بـــود
ســـرخوش از زمزمـــه‌ی آنـــان بـــود

عصـــرها بـــر ســـر پـــل پیـــر و جـــوان
شـــــادمانه گذراننـــــد زمـــــان

مشـــرق و مغـــرب آن مطلـــوب
وطنی که همـــه جـــایش همـــه خـــوب

بـــس کـــه ثـــروت در آن کشـــور بـــود
واقعـــاً مـــرز پـــر از گـــوهر بـــود

روی خاکش همـــه جـــا معـــدن و کـــان
زیـــر خـــاکش همـــه جـــا نفـــت روان

تـــه دریـــاش پـــر از مروارید
روی دریـــاش پـــر از قـــوی ســـفید

وه عجـــب آب گـــوارایی داشـــت
بـــاغ و بوســـتان مصـــفّایی داشـــت

*

## سال ۸۴ می‌آید

نه دگر بوی یار می‌آید
نه دگر بهار می آید
هر طرف رو کنی تو در هر جا
بوی جنگ و فرار می‌آید

*موشک مرگبار می‌آید*
*سال ۸٤ می‌آید*

شده دنیا همه جنگ و جدال
همه خلق جهان شده بیمال
حق بیچارگان شده پایمال
تا گروهی بهم رساند مال

*عید سرمایه دار می‌آید*
*سال ۸٤ می‌آید*

هر ابرقدرتی ز یک طرفی
می‌زند تیر خود به یک طرفی
تو که از بهر نان میان صفی
گر بجنبی ز تیر او تلفی

*تیرش از هر کنار می‌آید*
*سال ۸٤ می‌آید*

رهبران مثل افعی کژدم
نیش‌ها می‌زنند بر مردم
دلشان رفته پیش بمب اتم
کرده از این میانه خود را گم

*جنگ سوم به بار می‌آید*
*سال ۸٤ می‌آید*

هر ابر قدرتی شده حامی
بهر حفظ رژیم شاهنشاهی
تا کند قتل عارف و عامی
بدهد نفت را به آرامی

*نفت‌کش‌ها قطار می‌آید*
*سال ۸٤ می‌آید*

چشم خود شه حضرت ریگان
خانم تاجر، فلان، بهمان
هم جنس آندریف و میتران
ز آنچه نابود می‌کند ایران

*پشت هم مستشار می‌آید*
*سال ۸٤ می‌آید*

*

تێبینییەک:

شاعیری ناسکخەیاڵ، شێخ حەمەمارف، وەکوو لەم شیعرەی سەرەوەدا دەردەکەوێت داهێنەر بووە و بە بەرچاوگرتنی توانای زمانی کوردی بۆ ئاوازەکانی تایبەت بەخۆی، چوارچێوە و قاڵبی شیعری نوێی داهێناوە. بۆیە ئێمەیش ئەم شیعرەمان لە لاپەڕەی ٥٧دا وەکوو دەقی نووسراوەکەی شاعیر داناوە، تا ئێمەی کوردیش بڕوامان بە هێزی داهێنەری خۆمان لە هەموو بوارەکانا پتەوتر بێت.

